## پێشەکی

(1)

**هەڵوەشانەگەریو پۆست مۆدێرنە, هەر لە میانی بە دواداچوونی جیاوازیو ناودژییەکانەوە, ئەرزش بۆ بە پەراوێزکراوو دوورخراوەو چەپێنراوەکان دەگەڕێنێتەوە, وەك چۆن هەڵگری ستراتیژییەتێکی هەمەکییە, بە هەمان شێوەش لە ڕێگەی لۆژیكو زمان, پرسیار لە چەمکە بنەڕەتییەکانی فەلسەفەی خۆرئاوایی دەکاتو دوالیزمەکان هەڵدەوەشێنێتەوە. هەر لە ساڵی (1980) هەڵوەشانەوەگەری وەك پرۆژەیەکی تیۆری تەواوی بوارە زانستییەکانی گرتەوە, سەرەڕای بواری فەلسەفەو ئەدەبو شیکردنەوەی دەروونی, لە بواری هونەرو بیناسازیدا کۆڵەکە جێگرو بێ جوڵەکانی نەخشەی**

کۆنی خسته جوڵەو جێگیربوونی لە بنەڕەتەوە هەڵتەکاندو کۆمەڵێك ریشەو بونیادی نارێکو ئاڵۆزو پڕ رەهەندی لە شوێنی دانا, هەروەك کۆمەڵێك گۆشەو ناودژیو رەهەندی جۆراو جۆری بەرجەستەکرد, کە دواجار ئەو تاودژیو رەهەندو گۆشانە وەك مەسافەو هێزێکی پڕ ماناو ئیستێتیکی بەرز دەرکەوتن, هەر لە رێگەی ئەو ناودژیو جیاوازییانەوە بەردەوام نەخشەی دیکەی بەرهەم دەهێنایەوە.

(2)

لۆگۆسێنترالیزم یەکێکە لەو شانازییانەی کە ئەوروپا نازی پێوە دەکات, دیارە لە پشت ئەو سێنترالیزمانەوە کۆمەڵێك بیریارو فەلسەفەکار وەستاون, لەوانەش دیکارتو گوتەزاکەی بە زەقی دەردەکەون, بۆیە (من بیر دەکەمەوە, کەواتە من

هـەم) لـە لای دریـداو بـیری پۆسـت مۆدێرنـەوە دەخرێتە بەر راڤەکردنو لێکدانەوەی جیاوازەوە.
دیکارت لە نێوان (من)و (بیرکردنەوە) هـەژموونی ئـەوروپا بـە سـەر تـەواوی جیهانـدا دەبینـێ, منـی دیکارتی هەڵگری مێژووی ئەوروپایەو تـەعبیر لـەو سێنتەرە دەکـات, کـە ئـەوروپا بـەردەوام خـۆی تیـا دەبینێتەوە, منی دیکارتی منێکـی بـەرزو مەزنـە, لە نێوان بیرکردنەوەی دیکارتو من بە هیچ جۆرێك بۆشاییو دەرفەتێك بۆ منو بیرکردنـەوەی یـەکێکی دیکە بەدی ناکرێ, ئەوەش دەلالەت لەوە دەکات کە فیکـر لای دیکـارت تایبـەت بـەو منەوەیـەو, هـەر خودی ئەو منەش دەبێتە سەرچاوەی بیرکردنەوە, بەو مانایەش جگە لە (من) کەسـێکی دیکـەی جیـاواز توانای بیرکردنەوەی نییە, جگە لە ئەوروپا فیکر لـە هیچ شوێنێکی دیکە نادۆزرێتەوە, هـەروەها بەشـی

دووەمی گوتەزاکەی تەئکید کردنە لە سێنتەر, بێ ئەوەی ئەو منە هیچ کەفالەتێك بەڕەوا ببینێ, واتە ئەوەی کە دەیبینێ بەراستی بە خودی شتەکەی دادەنێ, لێرەدا سێنتەر دەبێتە ئەو ئاوێنەو بیرکردنەوە تیایە رەنگدەداتەوە, تەعبیر لە حەقیقەتو ئەسڵچی بیرکردنەوە دەکات, بەو مانایەش پرسیار لە هەبوون نییە, بەڵکو سێنتەر کە بیر دەکاتەوە (بیرکردنەوەش بۆخۆی ئەسڵو جەوهەری سێنتەرە) بوون دەچەسپێنێ, لە بەر ئەوەی ئەوە (من/سێنتەر)ە بیر دەکاتەوە, کەواتە بێ هیچ دوودڵیو نیگەرانیو گومانێك (بوون) دەبێتە راستییەکی حاشا هەڵنەگر, من بیر دەکەمەوە, کەواتە بە هێزی مێژوو, بە هێزی ئەسڵو جەوهەر, من هەم, کەواتە بە کەفالەتی سێنتەر بوونم حاشا هەڵنەگرە.

(من بیر دەکەمەوە, کەواتە من هەم) گوتەزایەکە فیکر تەنها بە لایەقی خۆی دەزانێ, خۆی ئەسڵو جەوهەری بیرکردنەوەیە, فیکری هێناوەتە ئاراوە, بەو مانایەش ئێمە, ئەوان ئێوە, تۆ, ئەویدی توانای بیرکردنەوەیان تیا بەدی ناکری, ئەگەر بیریش بکەنەوە, هیچ سەرچاوەو ئاوێنەیەکیان بۆ راستی بیرکردنەوەکەیان دەست ناکەوێ, خاوەنیمێژووی بیرکردنەوە نین, ناتوانن حەقیقەتی بیرکردنەوە بچنەسپێنن.

دیکارت حەقیقەتی بیرکردنەوەو جەوهەری بیرکردنەوە بۆسێنتەرو منی ئەوروپی دەگەڕێنێتەوە. لێرەوە دریدا پرسیارەکانی خۆی لەلۆگۆسێنترالیزم دەکاتو بە دوای بیرکردنەوەی ئەوروپیو دڵنیابوونی ئەوروپیدا دەچێ, پرسیار لەو منە دەکات, کە هەر تەنها خۆی بە جەوهەرو حەقیقەتی

شتەكان دەزانێ, دریداو تەواوی هەڵگرانی بیری پۆست مۆدێرن ئەو منە دەخەنە نێو گومانو هەموو چەقە بنبەستووەكان بە جێگیرنەبوو دەدەنە قەڵەم, كۆمەڵێك رەهەندو بیركردنەوەی جیاوازو چەقی پڕ بزاڤ و جێگیرنەبوو دەخەنە شوێنییەوە, هەر لە رێگەی ئەو بزاڤ و جێگیرنەبوونو جیاوازییانەوە بنەمای سێنترالیزم هەڵدەوەشێننەوە.

(3)

لە نووسینەكانی فەیلەسوفی رۆشنگەر(رۆسۆ) سروشت دەكەوێتە پێش رۆشنبیرییەوە ئەوەش راستەخۆ تەعبیر لەوە دەكات كە یاسای سروشتی لە نێو دڵدا نەخشەی بۆ كێشراوە, یان بە مانایەكی دیكە پەیوەستی نێوان دەنگو دەروون دەگەیەنێ, لێرەوە سروشت دەبێتە هەڵگری دەنگ, ئەو دەنگ و ئاخافتنەش لە نیو دڵ و دەروونی مرۆڤدایە,

لەنێوان رۆحی مرۆڤ نەخشەکانی خۆی دارِشتووە، ئەو نەخشەیەیکە سروشت کیشاوییەتی لە ناوەوەی مرۆڤدایە دەنگێکە لە خواوە سەرچاوە دەگریَ، ئاراستەی هەست ونەستی مرۆڤ دەکریَ، ئەو دەنگە لە ناوەوەی مرۆڤ دەخرێتە روو، دەنگی خوایە، هەر بە و مانایەش سروشت لای رۆسۆ پێش رۆشنبیریی دەکەویَ، چونکە ئەگەرررۆشنبیریی داهێنراوی مرۆڤ بیَ، ئەوە سروشت داهێنراوی خوایەو هەڵگری دەنگی خوایەو پیش رۆشنبیریی دەکەویَ، لە نێوان سروشت و رۆشنبیریی، لە نێوان خوا و مرۆڤ ، دەگەینە دوالیزمیەتی (رۆح/ جەستە)، کەواتە کە رۆسۆ سروشت پێش رۆشنبیریی دەخات، دەیەویَ بڵێ رۆح پیش جەستە دەکەویَ، دەیەویَ بڵێ سروشت هوشیارکردنەوەی رۆح دەگەیەنیَ و جەستە شەهوەت دەبزوینیَ، بەڵام ئەگەر سەیری هەر دوو

زاراوەی(رۆشنبیریی/سروشت) (سروشت/رۆشنبیریی)بکە, بۆمان دەردەکەوێت, کە یەك لایەنە نییە, یەك ئاراستەی نییە, وەك چۆن رۆسۆ لێی حاڵی بووە, ئەوەش هەرگیز بەومانایە نییە, کە سروشت بە بەرهەمی رۆشنبیریی لە قەڵەم بدەن, بەڵکو بە پلەی یەکەم دەلالەت لە هەڵوەشانەوەی ئەو دووالیزمە دەکات, چونکە هیچ دەقو گوتارێ لە دنیادا نییە, ناودژیو جیاوازی لە خۆدا هەڵنەگرتبێ, کاری دریداش بەرجەستەکردنی ئەو ناودژیو جیاوازییانەیە, خودی ئەو ناودژیو جیاوازییانەش لە رێگەی خوێندنەوەو راڤەکردن دەردەکەوێ, بەو مانایەش دریدا دەیەوێ هەر لە ناوەوەدا بە هۆی بەرجەستەکردنی جیاوازیو ناودژییەکانی ناوەوە هەڵوەشانەوە ئەنجام بداتو بونیادنانەوە دابمەزرێنێ.

(4)

ئامــانجی شــیکردنەوەی هەڵوەشــانەوەگەری دووبــارە بونیادنانەوەیــە, نــەك وێرانکــردنو رووخــان, بــەڵام بونیادنانەوە لـە سـەر رابـردوو نـا, بـەڵکو لـە سـەر ناودژیو جیـاوازی, ئـەوەش بـە دیوێـك تـەعبیر لـە هەڵوەشانەوە دەکات, بە دیوێکی دیکـە گەڕانـەوەی ئەرزشـــە بـــۆ چـــەپێنراوو قســـەلێنەکراو بـــە پەراوێزکراو...هتد.

ئەوەی کە زێـتر هەڵوەشـانەوەگەری سـەرقاڵ کـردووە مەسـەلەی ئاخافتنــە یــان فۆنۆســێنترالیزم, وەك دەزانین هەر لە ئەفلاتوونەوە ئاخـافتن (دەنـگ) وەك وێنەیەکی بنەڕەتیو بەرایی تەماشا دەکرێ, چونکە راسـتەوخۆ مەبەسـتو بیرکردنـەوەی قسـەکەر بـە شێوەیەکی ئامادە لە کاتی قسـەکردندا دەگەیـەنێ, کەواتـە ئـەو وێنەیـە راسـتەوخۆ تـەعبیر لـە عـەقڵی

قسەکەر دەکات, بەڵام خودی ئەو وێنەیە لە نووسین دووره, یان بە مانایەکی دیکە لە نووسیندا قابیلی بەدحاڵی بوونەو لە دانەر, یان قسەکەر ونە.

لای دریدا نووسین بە هیچ شێوەیەك ملکەچی ئاخافتن نییە, یان پاشەبەندی ئاخافتن نییە, (وەك رۆسۆ بۆی دەچێ), بە هیچ شێوەیەك دووالیزمو بەدوایەکداهاتووی ئاخافتن نییە, بەڵام نابێ وا تەماشای ئەو بیرکردنەوەیە بکەین, وەك ئەوە پێچەوانەکردنەوەی بۆچوونەکانی (سوسێر) بێ, بەڵکو راستەوخۆ کار کردنە لەو دووالیزمانەی کە سوسێر دەیخاتەوە, بەڵام ئەوەی کە هەر دوو بۆچوون لەیەك نزیکدەکاتەوە, ئەوەیەکە سوسێر لە بنەڕەتدا زمان وەکو سیستەمی جیاوازییەکان دەبینێو پێیوایە تەواوی زمان لە سەر هاوپەیوەندی وەستاوە, بە دیوێکی دیکەش زمان لە هەردوو

ئاستی داڵو مەدلولدا لە تۆڕێکی پڕ جیاوازی پێکهاتووە, بەڵام خودی ئەو جیاوازییە لە ئاستی ڕێزمانو گرامەریش ڕۆڵی خۆی هەیە, سوسێر ئەوە بە (تەزامنی) (تەعاقبی) وەسف دەکات, ئەو دوو تەوەرە جیاوازی لە بەرهەمهێنانی مانادا دەسازێنن, ڕاستە دریدا کاری لە سەر ئەو زاراوەیە کردووە بەڵام ئەو پێیوایە نەك هەر لە زمان بەڵکو لە ناخی هەموو شتێکی بەرواڵەت سەربەخۆو ئامادەدا ئەو جیاوازییە وجودی هەیە, هەروەها دریدا نووسین بە کردارێك دادەنی کە دژی دەربڕین دەکەوێتەوە, نائامادەیی دەنگ دەنوێنێ, بەڵام ئەو جیاوازییەی کە دریدا تەئکیدی لێدەکاتەوە بریتییە لە جیاوازی نێوان ئامادەو ونبوو, هەروەها جیاوازییەکی دیکەی نێوان سوسێرو دریدا ئەوەیە کە سوسێر تەنها پرۆسەی جیاوازیبوون بەرجەستە

دەکات, بەڵام لای دریدا دوو پرۆسەی جیاوازیو دواخستن لە ئارادایە, دەشێ بۆ ئەو بە دواخستنە(رۆلان بارت) بە بیر خۆمان بهێنینەوە, بەو مانایەش هیچ دەقێك هەڵگری یەك مانای نەگۆڕ نییە, بەڵكو هەڵگری مانای گۆڕاوە ئەوەش راستەوخۆ بە خوێنەرو ساتی خوێندنەوەو ئاستی خوێندنەوەو خوێنەر دەلکێ, کەواتە دەق لە کاتی خوێندنەوە کۆمەڵێك مانا بەرجەستە دەکاتو کۆمەڵێکیش بەدوا دەخات.

بێگومان تەئکید کردنی سوسێر لە بنەمای دەنگ هەر تەنها مەسەلەیەکی زمانەوانی نییە, بەڵکو لە پشت ئەو بنەمایەوە بیرکردنەوەیەکی میتافیزیکی ئامادەیی هەیە, ئەو میتافیزیکە دریدا ناوی ناوە میتافیزیکای ئامادە, لە تویێی ئەو میتافیزیکایەدا دەنگ ئەو وێنە میسالیییەیە, کە

**جۆرێـك لـە دڵنیـایی لـەخۆدا هـەڵگرتووە, ئـەو دڵنیاییە راستەوخۆ بەرۆحەوە پەیوەسـتەو لەوێشـەوە بەرەو خواو ئایینو پیرۆزی دەبێتەوە,**

**بـەڵام دریـدا وەزیفـەی وشـەی دەربـڕاو بـە ئامـاژەی زمانەوانییەوە دەلكێنێ, وشەی دەربڕاو لە ناوكۆیی جۆراوجۆردا خۆی دووبـارە دەكاتـەوە, بـە مانایـەش وشەی دەربڕاو دەكەوێتە دەرەوەی قسەكەرەوە, دریـدا پێیوایە كاتێ كە ئاخافتن پێش نووسین دەخرێ, لەو كاتەدا مانا دەشێوێنرێو لە بنەڕەتدا بە شێوەیەكی بابەتیانـە دەبێتـە هـەڵگری كۆمـەڵێك پـۆلینی جیاواز, ئەوەش لە زمانێكـەوە بـۆ زمـانێكی دیكـە دەگۆڕێ, بە دیوێكی دیكەش دریدا پێیوایە مانـای زمانـەوانی بـە هـۆی یارییـە جیاوازییـەكانی نێـوان وشـەكان نەخشـەی بـۆ دەكێشـرێ, ئـەو یارییانـەش سـنورێكی دیـاریكراوو كۆتایـداریان نییـە, بـە**

مانایەش جیاوازیلا یارییەکان بە هۆی فیکری ئەسلّیو نیازی پێشو یان نیازێك لە دەرەوەی زمان دیاری ناکرێ, بەڵکو لە ناوەوەو بە هۆی ناودژیو جیاوازیەکانەوە بەرجەستە دەبێ.

لە فەلسەفەی خۆرئاوادا زۆر جار ئاخافتن پشت بە نموونەو خواستن دەبەستێ, خودی نموونەو خواستنیش بە نووسینەوە بەندن, ئامانجە ئەوەش ئاخافتن وەك وێنەی نووسین وەسف دەکات, بەو مانایە نووسین بە شێوەیەکی راشکاوانە خۆی لە نێو ئاخافتندا هەڵدەگرێتەوە, لەو حاڵەتەدا ئاخافتن بە نیسبەت نووسین لاوەکی دەکەوێتەوە, ئەوەش هەرگیز بەو مانایە نییە, کە نووسین پێش ئاخافتن بخەین بەڵکو بەو مانایەیە کە لە نێوان ئاخافتنو نووسین ناودژیو جیاوازی لە ئارادایە, وەك چۆن هەر لە رێگەی جیاوازیشەوەی دریدا لە یەکییام

نزيك دەكاتەوە, هەر لە میانی لێكنزیكردنەوەشیان هەر دوو زاراوەكە بە یەكەوە دادەنێ, بەو مانایە ئاخافتنو نووسین دەبنە دارِشتن بۆ خودی نووسینی ئەسڵی, نەك تەعمیم كردن.

زمان بۆ خۆی سێنتەری نواندنە, بەڵام كاتێك كە ئاخافتن پێش نووسین دەخرێ, لەو كاتەدا وێنەی مانا دەشڵەژێ, لە رۆشنبیریی خۆرئاوادا دریدا جیاوازی لە نێوان ئاخافتن نووسین بە گردبوونەوە بە دەوری زماندا وەسف دەكات, گردبوونەوە بە دەوری زمان یان فۆنۆسێنترالیزم وامان لێدەكات كە ئاماژە زمانەوانییەكان لە رێگەی ئەو دیاردانەوە چارەسەر بكەین كە نوێنەرایەتیان دەكەن.

(5)

كەواتە نووسین نە دەرچوونە لە سیستەمی باوكایەتی, نە دەرچوونە لە سیستەمی دایكایەتی,

بەڵکو نووسین گەمەی داڵەکانە, هەروەها بۆ وێنەی جەستە ناگەڕێتەوە , بەڵکو بۆخۆی جەستەیەو چێژ لە خۆپیتێنی خۆی وەردەگرێت, لە ناوکۆیی خۆی خۆی بەرهەم دەهێنێ, نووسین گەمەیە, لە رێگەی ئەو گەمەیەوە جیاوازییەکان دەردەکەون, ئەوەش لەلایەك خۆشەویستی دەگەیەنێت بەو مانایەی کە ئارەزووی ئەویدیکە دەکات, لەلایەکی دیکەش دووبارەکردنەوە, یان بە مانایەکی دیکە رێگەدانە بە ناودژییەکان تاکو خۆیان دووبارە بکەنەوە, یان درێژە بە یارییەکان بدەن.

(6)

کاتێك قسە لە چێژبردنی نووسین دەکەین, بەومانایە نییە, کە هەڵگری ئامانجو ئاراستەی دریاریکراو, یان جولەکان لەو رێگەیەوە بە کار بخات, هەر وەك بەو مانایەش نییە, کە بۆ خودی

کارای خۆی بگەڕێتەوە, بەڵکو بەو مانایەیە کە هەموو سنوورەکان دەبەزێنیٚو هەوڵدەدا لە ڕێگەی دواخستنەوە شتێکی دیکە دابهێنیٚو تەواوی نیازەکان تەجاوز بکاتو لە هەڵچوونەوە گەمەکانی خۆی دابمەزرێنیٚ, لەوەی کە بەردەوام لە کرانەوەیەك بۆ کرانەوەیەکی دیکەو لە جیاوازییەك بۆ جیاوازییەکی دیکی جولە دەکات, ئەگەر لە میانی ئەو وازییەدا چیێژ بڕژیٚ, ئەوە لە ئارەزووکردنی ئەویدیکەوە خۆشەویستی پراکتیزە دەبیٚ, ئەوەش هەر تەنها گەڕانەوە ئەرزش نییە بۆ ئەویدیکەی بە پەراوێزکراوو کپکراو, بەڵکو لە هەمان کاتدا وەدواخستنی شوناسیشە.

لێرەدا دەتوانین بڵێین نووسین دەرچوون نییە, لە سیستەمی باوکایەتی (ئەفلاتووت)و

دایکایەتی(رۆسۆ) بەڵکو تەعبیرکردنە لە گەمەی دالەکان لە ئاسۆیەکی ئازادو کراوەدا,

(7)

دریدا دەڵێ هەڵوەشانەوە نەشیکردنەوەیە نە رەخنە, نە میتۆدو کارو کردارە... شیکردنەوە نییە, چونکە هەڵوەشاندنەوەی توخمەکانی بونیاد نییە, تاکو بگەینە توخمە سادەکان, یان تاکو بگەینە ئەسڵێك کە قابیلی هیچ چارەسەرکردنێکی دیکە نییە, هەروەك رەخنەش نییە, نە بە مانا (کانت)ییەکەو نە بە مانا گشتیەکە, چونکە هەرگیز نایەوی حوکم دەربکات یان شتەکان دیاری بکاتو سنوورەکانیان رەنگ بکات, هەروەها میتۆدیش نییە, چونکە ناشێ بۆ ئامرازەکانی میتۆدو کورت بکرێتەوە, یان بەرەو کۆمەڵێك یاساو ریسا پراکتیزەکردن هەنگاو بنێ, کە قابیلی گواستنەوە بێ, دواجار

کارو کرداریش نییە, چونکە بەشێك لە سلبیاتی لەخۆدا هەڵگرتووە, یان بە مانایەکی دیکە هەڵچوونە, ئەو هەڵچوونەش سلبیاتی ناوبراو بەرجەستە دەکات.
کەواتە نووسین ئەگەر بتوانین چەمکی (پێکەنین)ی بۆ لە (باختین) بخوازین, دەشێ پێکەنین بێ, پێکەنین بە (من, عەقڵ, ئەسڵ, سروشت, دەنگ...هتد) لێرەوە لە رێگەی پێکەنینەوە وازیو یاری وشەکانو ناودژییەکانو ئاماژەکان تەعبیر لە ئازادیو کرانەوەو قبولکردنی ئەویدیکە دەکەن.
نووسین پێکەنینینە بە مانایەی کە توانی لۆگۆسێنتریالیزمو فۆنۆسێنتریالیزم لەو شوێنە بەرزەوە بە پێکەنین بخاتو رووتیان بکاتەوە, کاتێك کە دەڵێین نووسین پێکەنینینە بەو مانایەیە کە ئەویدیکەی جیاوازو کپکراوو وسبەلێکراو لە ترس

ئـازاد دەكـات, كاتێـك ئەويديكـە لـە تـرس ئـازاد دەبێ, ئيتر پێويستى بە هيچ خواوەندێك نامێنێ.

وەرگێڕ

2005

هەولێر/مانگى ئادار

## ستراتیژییەتی جیاوازی لای دریدا

دریـــدا مـــرد ، دوای ئـــەوەی ماوەیـــەکی زۆر بەنەخۆشیەکی کوشندە تلایەوە، بەڵام لەدوای خـۆی ڕسـتێك دانـراوو تێـزی جـێ هێشـت، لـەبواری فەلسەفەو ئـەدەب و فیکـر و سیاسـەتدا کۆمـەڵێك کەسـی بـەو دانراوانـە سـەرقاڵ کـرد ، هـەروەها بەدرێـژایی ژیـانی کـاری لـە هەڵوەشـاندنەوە و لێکترازانی هەندێ بونیادی تیۆری و چەمك و تیۆرە فەلسەفیەکاندا کرد ، ئەو فەلسەفانەی کە بەدرێژایی

مێژووی فەلسەفە خۆیان بە قوڵی لەنێو زەمەندا چەسپاندبوو.
جاك دریدا سەر بە کۆمەڵێك لە فەیلەسوفانی فەرەنسایە کە بەناوی فەلسەفەی جیاوازییەوە دەناسرێن و فیکری جیاوازی و ئەویدیکەیان هێناوەتە ئاراوە، پرۆسیسەی جیاوازی و ئەویدیکە دەکەن، لەوانەش میشیل فۆکۆ، جیل دولوز، جۆرج باتای، فیلکس گاتاری، کلۆسۆفسکی، مۆریس بلانشۆ، ئەوانیدیکە.
هەموو ئەو فەیلەسوفانە لە فەلسەفەکانیاندا تەواو لەگەڵ مەزهەبە فەلسەفییە میتافیزیکیەکانی پێشوو، چ ماددی بێ، یان میسالی، جیا دەبنەوەو داوای کەشف کردنی ئەوە دەکەن کە (وس بەی) لێدەکرێ و گوێ لەو دەنگانە دەگرن کە دەنگیان

نابیسرێ، هەروەها ئەرزش بـۆ پـەراوێزکراوو دوور و لەبیرکراوان دادەنێن.

لۆژیکی فەیلەسوفانی جیاوازی دەرچوونە لەو رێگـە بنەستووەی کـە فەلسـەفە بـەهۆی پابەسـتبوونی بـە حیکایەتە گەورەکان و مـانای مێژوو و نیازی مـێژوو پێـی گەیشـتوون، بۆیـە هـەر دەبـێ ئـەو فەلسـەفە بنەسـتبووە لەرێگـەی لێکترازانـی پێکهاتـەکانی و دارزانی بونیادە پتەوەکانی هەڵوەشێتەوە، هـەروەها دەبـێ هـەموو ئەوانـەی لەجۆراوجۆرییـەوە بـەرەو یەکێتی و یەکبوون دەچن, هەڵبوەشێتەوە.

ماهیەتی زمان

فەیلەسـوفانی جیـاوازی لـۆژیکی سـێنترالیزم و پێناسەو دەمـەتەقێ و هاوچەشنی دەخەنە بەر رەخنە، جیاوازی وەك لۆژیك و پانتاییەکی نـوێ بەرجەسـتە دەکەن، بۆ ئەوەش ناگەڕێنەوە کە فەلسەفە لە خود و

لۆژیکی میتافیزیکیدا خۆی پراکتیزە بکات، یان لەتوێی سێنترالیزم و گوتاری باڵادا خۆی بنوێنێ، بەڵکو پێیانوایە کە دەبێ لەدنیای جیاوازیدا پانتایی ئەویدیکەو بەپەراوێزکراو و رەتکراوە، یان لەبیرکراوو دوور لەسێنتەر لەباشترین باردا بەرجەستەبکرێ،ئەوەش لە دەرەوە لەساتەوەختی بەجمگەبوونی لەگەڵ ناوەوەدا بەسەر دنیای شکۆو ئاواکردن، یان ئافەریدەکراو و تەجاوزکردنی واقیعدا، یان لەو جێکەوتەیەی کە بەرەو دنیای گۆڕانکاری و جیاوازی و لەیەکنەچوون دەچێ، خۆی دەنوێنێ.

دەتوانین بڵێین هەموو بەرهەمێکی فیکری هەڵگری زەمەنی تایبەتی خۆیەتی، بەو مانایەش هەموو دیاردەکان لەنێو ئەو زەمەنەدا لەگەڵ یەکتر جیاواز دەکەونەوە، جیاوازیش بەرێژەییەوە مەحکومە، بەڵام

لـەدووتوێی کـارو تێزەکـانی جـاك دریـدا دەقـی فەلســەفی بـــە جیاکارییـــە تایبەتیەکانیـــەوە دەردەکـەوێت، هـەروەها جیـاوازی هـەر لـەفیکری (ئەفلاتون) تا دەگاتە (هیگل) و تـەواوی مەزهەبـە گشـتگیرییەکان بـەرەنگاری فیکـری میتـافیزیکی دەبێتـەوە، وەك چـۆن بـەرەنگاری ئـەو کەلـەپورەش دەبێتـەوە کەسـنووری میتـافیزیکی بـۆ زمـان لەرێگەی عەقڵـەوە دیـاری دەکـات، دەلالـەتیش بـە مەعریفـەوە دیـاری دەکـات، هـەروەها وای لـەکاری میتـافیزیکی کـردووە کـەوەك ئامـادەیی، یـان ئامـادەبوون، لەرێگـەی پابەنـدبوونی فیکـر بـە وجودەوە دیاری بکرێ.

(هایدگـەر) لەرێگـەی شـیکردنەوەکانی هەوڵیـداوە مەسەلەی خودی کەینوونە بەوەی کە وجود یەکەمین کەینوونەیە لـەدنیادا و وجـودی مرۆیـی گفتوگۆیـە

لەگەڵ دنیادا خۆی لەدەسەلاتی میتافیزیکا رزگار بکات، هەروەها پێی وایە ئەو چالاکیەی کەزێترین رێژەی بەردەکەوێ گوێ گرتنە، نەك ئاخافتن، زمانیشی بەوە وەسف کردووە کە شوێنگەی بوونە (کەینوونە) هەر زمانیشە دەبێتە نێوەندی مێژووی بوون (وجود).

مابەلاّم هایدگەر بەشێوەیەکی میتۆدی زمانی دراسەنەکردبوو، هەر ئەوەش لای دریدا دەبێتە خاڵی دەستپێکردن و (زانستی نووسینی) لەسەر دادەمەزرێنێ، لەوێشەوە بەرەنگاری ریشەی نووسینی (فۆنیمی) دەبێتەوە، هەروەها بەشێوەیەکی زانستی رەخنە لەمیتافیزیکا دەگرێ و هەوڵدەدا لەرێگەی هەڵوەشانەوەی میتافیزیکاوە تێگەیشتنی زمان بەپێی نموونەی نووسین بەدەست بهێنێ، نەك بەپێی نموونەی ئاخافتن، بۆیە دریدا وا

وەسفی نووسین دەکات کە سەیرورەیەکە لەسەیرورەی زمان، ئەو سەیرورەیەش لەرێگەی جیاوازییەوە کار دەکات و وەك چەمکێك یان شتێك کە قابیلی بیرکردنەوەیە دانانرێ، بەڵکو وەك جیاوازی هەڵچوون وەسفی دەکات، یان وەك دواخراوێك کەجیاوازی بەرهەم دێنیٚ.

هەروەها دریدا جیاوازی بۆ رەخنەی هاوچەشنی خۆرئاوایی و خولیای گردبوونەوە بەدەوری سێنتەر کە خۆی لە لۆگۆسێنرالیزمدا هەڵدەگرێتەوە بەکار دەهێنیٚ، لەلایەکی دیکە فیکرەی ئامادە (ئەوەی کە لەئارادایە)و لەگەڵ لۆگۆس رِێ دەکات، لە فیکرەیەکدا خۆی نمایات دەکات کە مەوجود تیایدا بەو وەسفەیە کە ئامادەیە، بەو مانایە وجود (کائین) وەك چۆن هایدگەر وەسفی دەکات ئامادەیی لە شتەکاندا بەدەردەکەوێت، دریداش

بەمیتافیزیکای ئامادە ناوی دەبات و لەوێشەوە هەوڵدەدا کۆڵەکەکانی بگۆڕێ، هەروەها لەرێگەی هەڵوەشانەوە ناودژییەکانی کەشف دەکات.
بەجۆرە دنیای میتافیزیکی دەبڕێ، ئەو دنیایەی کە ئاخافتن پێش نووسین دەخات و بەپێشووتری دادەنێ. هەروەها لە ئاخافتندا گوتراو جیاکارییە تایبەتیەکانی خۆی هەیە، چونکە ((ئامادەیی گوتەبێژ لەکاتی دەربڕینی ئاخافتندا بەرجەستەدەکات و گوێگر بۆ خۆی دەستەبەر دەکات)) هەروەها شەقڵێکی دیکەی راستەوخۆ لەکردەی ئاخافتندا هەیە کەهێزێکی تایبەت بە قسەکەر دەبەخشێ، بەجۆرە ئاخافتن بەسەر نووسیندا بەرجەستە دەبێ و پەسەند دەکرێ و فۆنۆسێنترالیزم دادەمەزرێ، دریدا فۆنۆسێنترالیزم

بــه خەســڵەتێك لــه خەســڵەته بنەڕەتییــەكانی لۆگۆسێنترالیزم دادەنێ.

دریدا له كتێبەكەی كەبەناوی (زانستی نووسینه) بانگەشەی دووبارە چاوخشاندنەوە بە ڕۆڵی نووسین دەكات ((نەك بەو خەسڵەتەی كە پەردەیەكە بۆ ئاخافتنی دەبڕاو، بەڵكو بەو خەسڵەتەی كە قەبارەو تایبەتمەندی و جیاكاری خۆی هەیە، بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە كەواقیع لەدەرەوەی خۆی بەرهەم بهێنێ، وەك چۆن لێشی كەم ناكاتەوە)) چونكە لەدیدی دریدا نووسین دژی گوتە ((بێژەی دەربڕاو)) دەوەستێ و نوێنەرایەتی نەبوونی دەنگ دەكات، بەجۆرە كەینوونە ((بوون)) وەك حاڵەتی بەناوداچوونی زمانی جیاوازی و هەڵقوڵینی بێدەنگی لەنووسیندا لەدایك دەبێ.

دریــدا بــەدوای نووســینی یەکەمــدا دەچــێ، ئــەو نووســـینەی کەدەکەوێتـــە پـــێش هـــەموو ئـــەو نووسینانەی کە مرۆڤ نووسیویەتی، تاکو بەنێوەندی یەکـــەمی زمـــانی دابنـــێ و لەپاشـــان کـــاری هەڵوەشـــانەوە لـــەرووخانی چـــەمکە باوەکـــانی میتافیزیکـا ئامانجـەکانی خـۆی هەڵدەگرێتـەوەو لەســەر ئاســتی چــەمکدا پەیوەندییــە دامــەزراو کۆنترۆڵکراوەکـــانی نێـــوان ئاخـــافتن و نووســـین، سروشــت و رۆشــنبیری، رۆح و مــاددە، مــەعقول و هەســـتپێکراو، لۆژیـــك و رەوانبێـــژی، ســـەرەوژێر دەکاتەوە، هەروەها بەتایبـەتی هـەوڵ بـۆ سـەرەوژێر کردنی میکانیزمیـەتی لۆژیـك بەسـەر رەوانبێژیـدا دەدات، خـــودی ئـــەو میکانیزمـــەی کـــە هـــەر لەئەرستۆوە هەتا ئێستا بەپیرۆزی ماوەتەوە.

**جاك دريدا لەگەڵ زانای دەروونشیكاری فەرەنسی**
**ئەلیزابیس رۆدینسكۆ**

**جیاوازی وەك چەمك ناكەوێتەوە، هەروەها سلبی نیە بەمانا لاهوتیەكەی بۆ سلبیەت، بەڵكو دریدا بە میتۆدێكی ستراتیژی رێك لەقەڵەمی دەدا، ئەوەش بەو مانایە نیە كەتەكتیكی دیاریكراوی هەبێ و لەرێگەی ئامانج و هۆكاری دیاریكراوەوە بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێ، بەڵكو بەهایەكی ئەزموونی لەخۆدا هەڵگرتووەو بێ ئامانجە ((چونكە بەهای ئەزموونی تەواوی ماناكانی خۆی لەناودژی لەگەڵ لێپرساوێتی فەلسەفەدا بەدەست دەهێنێ)) هەروەها جیاوازی مانای جیاواز و دواخراو بۆ زەمەنی جیاواز و شوێنی جیاواز هەڵدەگرێ و بەرەو دونیای گۆڕاو دەیگوازێتەوە، لەبەدەستهێنانی عەقڵانیانە بۆ دنیا دوور**

دەکەوێتەوە بۆیە ئابلۆقە نادرێ، یان بەهیچ جۆرێ جوڵەکانی بەوشەیەك، یان چەمکێك داناخرێ، پەیڕەوکەرانیشی والێدەکات بۆ پێدراوەکانی دنیا تێگەیشتنی فیکر دووبارە بکەنەوە.

هەندێجار جیاوازی ئاماژە بە پێشنیاری لێکچوون، یان لێکجیا لەشێوەو تایبەتمەندیدا نادات، بەڵکو زۆر لەوە گشتگرتر دەکەوێتەوە، وەك چۆن نوێنەرایەتی پەرچە کرداری لێکچوونیش نیە، بەڵکو بۆخۆی لێکچوون و دژبوونەوە دەسەپێنێ، یان نە ئەوەو نە ئەم، بەجۆرە بەردەوام پانتایی جیاواز لەقولاییدا دەشارێتەوە و وێنەکەی دەردەخات، ئەوەش جۆرێکە لەحاڵەتێکی تایبەتی گوزەرکەر، تێگەیشتن تیایدا چەسپاو نییە.

دریدا جیاوازی وەك کارێکی پرسئامێز وەسف دەکات، وەك کارێك لەنێو بۆشاییدا ئامادەی

دەکات، ئەو کارەش لەنامۆبوونی ماناکانی خۆیدا بۆ ئێمە کەشف دەبێ و زۆرترین توانا بۆ راڤەکردن و تەئویلکردن دەکاتەوە.
دریدا لەدووتوێی جیاوازیدا بەدوای ئەوەدا دەگەڕێ کە زمان لەهەموو هێز و توانا رەهاکانی رزگار بکات، هەر لەوێشەوە جیاکاری دەخاتە فیکری مۆدێرنەوە، لەهەمان کاتدا تەواوی گوتەزا فەلسەفیەکانی خۆرئاوا پێچەوانە دەکاتەوە، بەهۆی وزەی دەلالەتە تایبەتیەکانیەوە زمانێك بونیاد دەنێ دوور لەنموونەی نووسینی فۆنیمی، یان دوور لەو نووسینەی کەبەپێی ئاخافتن فۆرمەلەکراوە، هەروەها جیاوازی بەو سیفەتەی کە چالاکیەکی ئازادە بەئاخافتنی ناوەوەی دادەنێ، کەنوێنەرایەتی کەلێنێکی گرنگ لەدابڕان لەگەڵ میتافیزیکای خۆرئاوا دەکات، ئەو میتافیزیکایەی

کەبەشێوەیەکی مێژووی لەسەر کۆمەڵێك سێنتەر، سێنتەری عەقڵی، سێنتەری فۆنیمی، سێنتەری تیشکی، سێنتەری خۆری، سێنتەری ئیتنی... هتد رابۆتەوە.

میتافیزیکا لەبەرامبەر نووسین, ئاخافتن پەسەند دەکات و بەرایی بەو دەبەخشێ، بەجۆرە سێنترالیزمی لۆگۆسی لەراستیدا دەبێتە سێنترالیزمی فۆنیمی، کاتێك کە قسەکەریش گوێی لەدەنگی خۆی دەبێ، کۆمەڵێك شێوەی دەنگی بەرهەمدێنێ و دەلالەتە دواخراوەکان حاڵی دەبێت، لەهەمان کاتیشدا شێوە هەستپێکراوەکانی دەنگ درك پێدەکات.

دریدا دەڵێ ((لەکەلێنێکی داخراوی ئەزموونی وادا، وشە وەك یەکەیەکی سەرەتای —بەرایی-دەژی، بۆ مەدلول و دەنگ، بۆ چەمك و تەعبیرکردنی

شەفاف شیٚ ناکریٚتەوە)) کەواتە فۆنۆسیٚنترالیزم جیاکاری میتافیزیکی ئەوەیە کە مامەڵە لەگەڵ بووندا دەکات، بەو سیفەتەی کەشتیٚکە هەمیشە ئامادەیە، بۆ تەجاوزکردنیشی هەر دەبیٚ ریٚگە جیایەکە ببڕین.

دریدا وایدادەنیٚ کە نووسین هەموو دەقیٚك لەناوکۆیی پیٚکهاتەکەی خۆی دەکاتەوە، ئەوەی کە دەڵیٚ دەبیٚ نووسین لە دانەر ئازاد بکریٚ، بۆ ئەوەیە کە بەردەوام ئاماژەی نووسراوەکان لە ونبوونی دانەر دیاری بکاو لە دەرەوەی ژیانی دانەر و نیازی دانەر کۆمەڵیٚك رەهەندی دەلالی بخاتەوە، پاشان نووسین لەهەموو بارودۆخیٚکدا ریٚگا بە دووبارە خویٚندنەوە دەبەخشیٚ و بەشیٚوەیەکی سەربەخۆ لەقسەکەرەکان و ئەوانەی کە فۆرمەڵەیان کردووە بەرجەستە دەبیٚ، وەك ئەوەی کە پرۆسەی یەکەم و بەرهەمهیٚنەری

زمانـه، بـەجۆرە دریـدا بـۆ چەسـپاوە پێشـینەکانی شـــێوەی دەنگـــی، بـــەدوای نووســـینی یەکـــەم (ســـەرەتایی)دا دەگـــەڕێ و لـــەو شـــوێنەوە دەســـت پێـــدەکات کـــە نووســـین بەمانایـــەك لـــەماناکانی نێوەندی یەکەم، بەرایی زمانە، بەڵام نـەك مشـەخۆر بەسەر ئاخافتندا، بەڵکو مشەخۆری بۆخۆی کاتێـك بـەجێگیرکردنی دەلالەتـەکان هەڵدەسـتێ و وایـان لێدەکات شێوەی زاراوەیی و دامەزراویی وەربگـرن، ئەوە سروشتی ئاخافتن پراکتیزە دەکات، بۆ ئـەوەش پشت بەتایبەتمەندیەکانی خـودی نووسـین دەبەسـتێ کە (( بەر لە بۆلوانی نووسین و لـەدەرەوەی ئاسـۆی نووسیندا بیر لەکردنەوەی مەحاڵ دەکەوێتەوە)).

گەڕاندنەوەی ئەرزش بۆ ئەویدیکە

گەڕانمان بەدوای نووسینی یەکەم و بەرایی خـۆی لـە بنەڕەتی ئاخافتن و وشەی نووسراودا هەڵدەگرێتـەوە،

بەلاّم ئەوە قابیلی وەسف کردن و جێگیربوون نیە، هەروەها وەك (سوسێر) ئاماژەی بۆ دەکات سیستەمی خودی ئاخافتن خۆی لەسەر جیاوازی نێوان ئاماژەکان بونیاد دەنیێ، نەك یەکەی مانا، بۆیە ئاماژە بۆخۆی دەلالەت لەشتێکی دیاریکراو ناکات، بەڵکو دەلالەت لە جیاوازییەکانی دەکات، بەجۆرە لەنێوان ئەو ئاماژانەی کەهەندێك بەرەو هەندێکی دیکە دەبەن جیاوازی دێتە بەرهەم. بەلاّم تەعبیرە زمانەوانیەکان جا چ بەشێوەی فۆنیم (دەنگ) دەربکەون، یان بەشێوەی جێکەوتە بەجۆرێك لەجۆرەکان لەپای نووسینی یەکەم بەکاردەهێنرێن. هەروەها هۆیەکانی تەعبیر کردن هەموویان لە بنەڕەتدا لەدووتوێی نووسینەوە دەردەچن، بەلاّم نووسین بایەخ بەو هۆیانە نادات کە

شێوەی بیستراوو نووسراو بەکاردەهێنن، چونکە نووسینێکە زمان تیایە دەردەکەوێ.
هەروەها بەمانا بەربلاوەکەی جیاوازی بۆخۆی یارمەتی بەجمگەبوونی ئاخافتن بەسەر نووسیندا دەدات، وەك چۆن بەرەنگاربوونەوەی میتافیزیکی لەنێوان هەستپێکراوو بەعەقلکراو دادەمەزرێنێ، هەروەها نێوان دال و مەدلول.
بەجۆرە جیاوازی بەرەو بەرەنگاربوونەوەی نێوان پێکهاتە دەلالیەکانی ئاخافتن دەبێتەوە، بۆ ئەوەش هەر تەنها پشت بە تایبەتمەندییە خودییەکانی نابەستێ، بەڵکو پشت بەجیاوازییەکانی نێوانیان دەبەستێ، پێکهاتەی ئاخافتن والێدەکات کەلەجیاوازی ئەویدیکەو لەپاڵ زنجیرەیەك لادان (خزین)و پەیوەندییە دواخراوە بێ کۆتاییەکان خۆی هەڵدەگرێتەوە، بەجۆرە جیاوازی دەبێتە لادانێك

بەهۆیەوە زمان خۆی لەسەر جیاوازییەکانەوە بونیاد دەنێ، ئەو جیاوازییانەش لادانی جۆرین و بەرەو تایبەتمەندی خۆیان دەچن.
لەدووتووێی خوێندنەوەی جیاوازییەوە لادان کەشفی ئەوە دەکات کەدەق تەنها یەکێك نییە، ئەرکی دەقیش دەرچوونە لەمەزهەبە فەلسەفی و میتۆدەکانی خۆرئاوا کە لەناو زماندا وەك دەسەلاتێك خۆیان بەسەر چەمکەکاندا دەنوێنن و تەواوی فەلسەفەی خۆرئاوایان وەك میتافیزیکای خواستن: خواستنی سێبەر و رۆشنایی، دیار و نادیار، زاهیر و باتن، دامەزراندووە.
خواستن بەگشتی وەك دریدا باسی دەکات گواستنەوەیە لە خۆزگەیەك بەرەو یەکێکی دیکە، لەدالێك بەرەو ئەویدیکە، خەلاتەکەشی لە ملکەچ بوونی یەکەم، گوزەرکردنی هاوشێوەئامێزی

کەینوونەیە لەژێر ئەوەی کە مەوجودە، دەبینێتەوە، ئەو خواستنە کێشکردن دەگەیەنێت و ئەو گرانیە بنەڕەتیەیە کە گوتار بەرەو خۆی کێش دەکات، بەشێوەیەك دایدەمرکێنێ کە لەنێو میتافیزیکا گەڕانەوەی بۆ نەبێ، هەر ئەویش لەباوەشی فەلسەفەدا مێژووی کەوتنی فیکری بینی، ئەو کەوتنەش نەوەیەکی لەخۆدا هەڵگرتبوو، نەوەیەك هەر لەدریداوە تا فۆکۆ تا بارت و دۆلۆز، ئەو نەوەیە بەچاوی خۆی ڕەوینەوەی وەهمی ڕووداوی ئایاری (1968) فەرەنسای بینی، بۆیە بایەخی دەرچوون و لادان لەو مێژووە بەرەو دنیایەکی بەهێز و ڕاستەوخۆی بردن، کە هەر سەربەخودی خۆی نییە، بەڵکو بەر بەو پانتاییە جیاوازەشە کە ئەویدیکە وازی تیا دەکات، بۆیە ئەو نەوەیە نووسینیان وەك دەرچەیەکی هاوشێوەی دابەزینی

مانا دەبینی کەدەکەوێتە دەرەوەی خۆی و لەنێو خۆیدایە: لێرە لەسەر ئەو زەوییە خواستن لەپێناو ئەویدیکەو بەرامبەر ئەویدیکەیە. خواستن لەبری میتافیزیکایە ئەگەر بمانەوێ ئەویدیکە دەربکەوێ دەبێ (کیان) تیایدا پەردەپۆش بکرێ ئەوەش هەڵکۆڵینە لە ئەویدیکەو بەرامبەر ئەویدیکە.

بەمجۆرە لادان و جیاوازی بەمانایەك لەماناکان گەڕانەوەی ئەرزشە بۆ ئەویدیکە، خۆرئاوایی ئەوروپی بەشێوەیەکی مێژوویی بەدەوری خودی خۆیدا کۆمەڵێك سێنتەری دروست کردووەو سێنترالیزم لە مۆدێرنەو پۆست مۆدێرنەدا رووەکانی خۆرئاوایی ئەوروپی بوو، لەوێشەوە بۆ رەشکردنەوەی ئەویدیکە خۆی لەبەرەی بەرەنگاربوونەوە هەڵدەگرتەوە. بۆیە کۆمەڵێك لە فەیلەسوفکاران کەپێشتر ناومان هێنان (کۆمەڵەی

نیچــەیی) هەوڵیانــدا ئــەو گوتــەزا فەلســەفیانەی سێنترالیزم بەتاڵ بکەنەوە بۆ ئەو بەتاڵ کردنەوانــەش جەختیان لە تەواوی بوارەکـان و لەسـەر ئەویدیکـەو جۆراوجۆری دەکرد.

سەرچاوە:

ئینتــەرنێت/ ســایتی ئــیلاف. نووســینی-عومــەر کوش.

له نێو رۆشنبیریی فەرەنسیدا دریدا شان بە شانی فۆکۆو دۆلۆز یەکێکە لە دەنگەکانی فەلسەفەی جیاوازیو هەوڵیداوە (هایدگەر) لە تەئویلاتی وجودییانەی (سارتەر) رزگار بکات. هەڵوەشانەوەگەری وەك (بننگۆن) لەو کتێبەی کە لە سەر دریدا نووسیوویەتی ئاشکرای دەکاو دەڵێ: هەڵوەشانەوەگەری تەرجەمەی زاراوەی وێرانکردنی هایدگەرییە. ئەوە هایدگەرە کە لە لێکۆڵینەوەیەکی کورتدا بە ناوی (ناسنامەو جیاوازی) ئاشکرای دەکات, کە فەلسەفەی ئەورووپی سەرەڕای فەلسەفە دوانییەکانو ئەوانی دیکەی فرەئامێزو ئەوانەی کە خۆیان بە شۆڕشگێر بە سەر رژێمەکاندا دەژمێرن کەچی هەموویان هەر لە ئەفلاتوونەوە بگرە, لە سەر بنچینەی تاکایەتی دامەزراون, چونکە شەپۆلی

زاڵ تیاندا ئەو شەپۆلە سێنتراڵییە بووە, کە لە سەر تاکێتی چەسپاوە, فەلسەفەی ئەفلاتوون و (دنیای هاوشێوەی ئەو) باشترین نموونەی ئەو تاکایەتیەن.

لە فەلسەفەی نوێشدا هیگلییەت لەو ڕێڕەوە دەرناچێ, ئەو دەوڵەت وەك هاتنی خوا بۆ سەر زەوی دەبینێ, بەڵام دریدا لە کتێبە جوانەکەیدا (دەنگ و دیاردە) ئاشکرای دەکات کە هۆسرەلی دامەزرێنەری فینۆمینۆلۆژیا هەر تەنها پەیامنێرێکی دیکەی میسالییەتی ئەڵمانی و درێژکراوەی فەلسەفەی ئەفلاتونەو جگە لەوە شتێکی دیکە نییە.

لەو بۆچوونە تاك ڕەهەندو مانا ئیمپریالیزەدا, ئاگایی تەعبیر لە ئامادەیی خود دەکات, ئەو وجودەیە کە هەموو بە ناوی خود ناویانناوە,

هایدگەر ئەو ئامادەییەی بە دیاریکراوی ناو ناوە ئەنتۆلۆژی بوون. هایدگەر هەروەها پێش ئەویش نیچەو فرۆید لە سەر لۆژیکی ئاگایی‌و فەلسەفەی ئامادە کۆششیان کردووە.

نیچە هەوڵی نەداوە حەقیقەتێکی نوێ دابمەزرێنێ, هەروەها هەرگیز پرسیارە ترانسندنتالەکەی (کانت)ی نەوروژاندووە.

ئاگایی وەك پانتاییەکی دڵنیابەخش بۆ مەدلول‌و ماناو حەقیقەت ناگەڕێتەوە. ئەو دروستکەرەش نییە کە ئیکتفا بە خودی خۆی بکات. بە پێی تەعبیری دریدا ئەو پاڵەوانە چەمکئامێزەی (نیچە) کە زەردەشتی ناوە تەعبیر لە هەڵوەشانەوەی گراماتۆلۆژیای میتافیزیکا دەکات, بێ ئەوەی

مرۆڤ (فرۆید)ی له بیر بچێ, كه ئەویش بۆ خۆی نكۆڵی له سیستەمی ئاگایی لاهوتی دەكرد.
(ساره كۆفمان) له كتێبی "خوێندنەوەی دریدا" به روونی ئاشكرای دەكاتو رایدەگەیەنێ, سەرەڕای ئەوەی كه فرۆید نائاگایی وەك سیستەمێك درككردووه, بەڵام دەكرێ بڵێین كه نائاگایی هیچ شوێنێكی نییەو ناشێ به خەسڵەتی ئامادە ناودێر بكرێ, بەڵكو له دنیای "من"دا دەبێتە تۆی ناسیستەمی, بەجۆرەش وەك چەمكی "نووسینو جیاوازی" بونیادی میتافیزیكا به توونـدی دەلەرزێنێ.
نیچەو فرۆیدو هایدگەر, هەروەها به تایبەتی بونیادگەری كاریگەری گەورەیان له سەر فەلسەفەی جیاوازی هەبووه, بونیادگەری وەك فەلسەفەی

**مردنی مرۆڤ بەرگری لە فیکرەیەك دەكات, ئـەویش ئەوەیـە کـە نووسـەر وەك (جولیـا کریسـتیڤا) لـە کتێبـی "زمـان ئـەو ونبـووه" ئاراسـتەکانی بونیادگەری بەجۆرە دەکێشێ, دەڵێ زمـان بـە پێـی رێبازی بونیادگەری بۆ زانست دەبێتە بابەتێك نـەك وەك ئەوەی کە خۆی ونبکات بەڵکو وەك ئـەوەی کـە هەر لە ئێستاوە بە پێی یاسـا تایبەتییـەکانی قسـە دەکـات, ئـەو یاسـایانەی کـە دەشـێ بـە بیرۆکـەی جیاکردنەوەی زمـان لـە قسـەکەرکورتی بکەینـەوە, کاری زمانیش ئەوەیەکە سێنتەری مرۆڤ و تـەنیایی مرۆڤ بلەرزێنێ.**

**ئەگەر رێنیسانس هەڵگری دروشمی مـرۆڤ بـێ دژی خواوەندەکانی چەرخی ناوەڕاست, ئەوە بونیادگـەری**

**هەڵگری دروشمی زمانە بە دژی مرۆڤ ..... مرۆڤ وەك ماناو ئایدۆلۆژیا.**

**بونیادە میتافیزکەکانی سوسێری زمانەوان**

**دریدا لە بەشی دووەمی کتێبەکەی "پەراوێزی فەلسەفە" کە ناونیشانی "جیاوازی" هەڵگرتووە بە نووسینی وشەی "جیاوازی" بە رێنووسێکی نوێ دەستپێدەکات ئەویش هەر تەنها دەلالەت لە تێکشکانی رێنووسی ئەرسەدۆکسی ناکات, بەڵکو تێکشکانی ئاگاییو تۆتالیتارییەتیش دەگرێتەوە بێگومان(سوسێر) یەکەمین کەسێکە کە درکی بە گرینگی جیاوازی کردووە, ئەویشی وەك مەرجێ بۆ توانای دالەکان داناوە. زمان لای ئەو سیستەمێکە**

لە جیاوازی, هیچ بونیادێك نییە كە یەكەكانی جیاوازی نەگەیەنێ.

بەلاَم لای دریدا جیاوازی نە وشەیەو نە چەمك هەروەها دریدا بۆ ئەوە كار ناكات كە پاساو بۆ نووسینی وشەی جیاوازی بهێنێتەوە, چونكە نابێتە بەندەی لۆژیكی دەمەتەقێئامێز.

,راستە پیاو دەتوانێ ئەو جیاوازییە بخوێنێتەوەو بنووسێ, بەلاَم ناتوانێ گوێی بۆ بگرێ "چونكە قابیلی بیستن نییە" دریدا دەلێ جیاوازی هیچ پەیوەندی بە سیستەمی ئاگاییەوە نییە, وەك چۆن پەیوەندی بە سیستەمی ئەزموونەوە نییە, سێنترالییەتی دەنگی هەمیشە سێنترالییەتی عەقلی دادەپۆشێ, هەروەها دریدا نایەوێ هیچ بلێ, فەلسەفەكەی ویستی گوتنی نییە.

جیاوازی هەموو شێوە دووالیزمییەکا تەجاوز دەکاتو هەمیشە پیتی یەکەمی ئەبجەدی لاتینی تیایە ونە, هیچ ناڵێ نە بە سروشتیو نە بە ئاگایی, هیچ حەقیقەتێکیشی لە خۆدا هەڵنەگرتووە, دریدا ممارەسەی فەلسەفەی کلاسیکی ناکات, هەروەها لۆژیکی جیاوازی هەر تەنها لۆژیکێکی نا ئەنتۆلۆژی نییە, بەڵکو بۆ خۆی نالۆژیکیشە, بە زمانی دریدا: سەرکێشو ستراتیژئامێزە, ستراتیژییە واتە وجودێکی ترانسندنتالیانەی بۆ حوکمکردن بە سەر نووسیندا نییە, نووسین دژی هەموو شێوە ئەنتۆلۆژیو لاهوتییەکان دەوەستێ. سەرکێشیشە چونکە نووسین خۆی لە پێناو ئامانجێکی دیاریکراو زیندانی ناکات, یان بە شێوەیەکی ستراتیژی لە

نوێوە بەڵگە بۆ دروستی پێشەکییەکانیو بە خاوەنبوونی خۆی ناهێنێتەوە, بەڵکو ستراتیژییەتێکی بێ ئامانجە, ستراتیژییەتی ونبوونو لە یادچوونە, دریدا نایەوێ سیستەمێکی فەلسەفی نوێ بونیاد بنێ, هەروەها جیاوازی شوێنێکی نوێی بۆ مەدلولو حەقیقەتەکان نییە, بەڵکو پرۆژەیەکی هەڵوەشانەوەئامێزە, ئەوەش بە روونی لە خوێندنەوەی دریدا بۆ (سوسێر) دەردەکەوێ.

دال لای سوسێر لە ساتەوەختی ونبوونی مەوجود دەردەکەوێ, بۆیە دال دەکەوێتە پلەی دووەمەوە, لە دەرئەنجامی ئەوەشدا جیاوازی هەر تەنها وجودێکی کاتی دەبێ. دریدا هەوڵدەدا تەجاوزی ئەو جیاوازییە کاتیە بکات چونکە ئەو جیاوازییە وەك بەندەی

"ئامادە" دەمێنێتەوە, زمانەوانی سوسێر سەرەڕای ئەوەی کەپێشوازی لە زمان و دەلیل دەکات, بەڵام لای دریدا هەروەك بەندەی میتافیزیکا دەمێنێتەوە.
(بننگۆن) لەو کتیبەیکە لەسەرەوە ناومان برد زۆر بەجوانی ئەوەی روونکردۆتەوە, ئێمە لێرەدا دەتوانین بیروڕایەکانی لە دوو خاڵدا کورت بکەینەوە: یەکەم: چەمکی دەلیلی میتافیزیکی "واتە دەلیل لای سوسێر" کە جیاوازی دەخاتە نێوان دال ومەدلول, بۆ خۆی دەکەوێتە نێوان ئەو دوالیزمانەی کە جیاوازی دەخەنە نێوان هەستپێکراوو عەقڵانی لەم رووەوە سوسێر هەر تەنها هەوڵیداوە لە نوێوە بێتە خاوەنی ئەو دوالیزمە, ئەگینا کارێکی دیکەی بە ئەنجام نەگەیاندووە . دووەم: هەڵوەشانەوەگەری بە دژی

مەرجەعییەت , بەرگری لە بەرایبوونی دەلیل دەکات, پێیوایە لەدەرەوەی دەلیلەوە شتێك بە ناوی مەرجەعییەت وجودی نییە, فەلسەفەی جیاوازی بەگەرمی پێشوازی لە دەلیل وپلەی دووەم دەکات , بەمجۆرە دریدا بە توونـدی دەسەڵاتی ئامادە رادەتەکێنێ, ئەو دەسەلاتەی کە وامان لێدەکات بەردەوام لەدووتوێی دیارو نادیاردا بیر لە وجود بکەینەوە . جیاوازی نە خودە و نە ئەسڵە و نە مەرجەعییەتە, هەتا ئەگەر هاتوو لە بارەی خودی جیاوازیش لە دریدا بپرسی هیچ ناکات, بەڵکوخودی پرسیارەکە هەڵدەوەشێنێتەوە, هەروەها پرسیار کردن لە ماهییەت بۆخۆی پرسیارێکی میتافیزیکییە"هایدگەر" گەیاندییە

داپۆشـــینی وجــود (واتــە هایدگــەر ئــەو جــۆرە پرسیارانەی بە داپۆشینی وجود دادەنا-و.کوردی) . بــەجۆرە دریــدا بــە نووســین دژی ئاگــایی ئاهــەنگ دەگێــڕێ , نووووســین مێیــەو ئاگــایش لــە هــەموو مێیــەك دەترســی, ئاگــایی لــە گواســتنەوەی بــەرەو نووسین دەترسێ, چونکە بۆ ئەو دەبێتە لەدەستدانی بەرزیو پیرۆزی, نووسین مردنی خـالق رادەگەیـەنێو تــەجاوزی لــوژیکی پێناســە دەکــات, بــەپیێ تــەعبیری"ســارە کۆفمــان" وەك ئیزافەیــەك, وەك بوونەوەرێکی دووڕەگ, وەك درەختێکـی بـێ ریشـە, دەقێکی بێ یاسای دیاریکراو, دەقێکی کـراوە, بـە سەر دەقگەلی دیکەدا, بەسـەر ئەویدیکـدا جێبـەجێ دەبێت.

دریداو هۆسرەل: هەڵوەشانەوەی ناوەندێتی دەنگی

هەندێ لە رەخنەگرانی ئەڵمانی پێیانوایە بە راستی (ئەدمۆند هۆسرەل) گرنگترین فەیلەسوفێکە کە بەشەرییەت لە دوای ئەفلاتوونەوە ناسیبێتی, گرنگییەکەشی ئەو کاتە زێتر بەرجەستە دەبێ کە کتێبەکانی پۆست مۆدێرنە دەخوێنینەوە, دەشێ فەلسەفەکەی وەك پرۆژەیەکی رەخنەئامێزو هەڵوەشانەوەی سیستەمی ئاگاییو فەلسەفەی ئامادەگی هۆسرەلیانە وەسف بکەین, نموونەش بۆ ئەوە رەخنەکەی دریدایە لە بارەی فەلسەفەی هۆسرەلەوە کە دەشێ بەجۆرە لە رستەیەکدا کورتی بکەینەوە کە لە کتێبی "دەنگودیاردە" وەرگیراوە: مانا بۆ ئەوەی کە قسە دەکات پارێزراوە. مانا نموونەو عەقلانییەتە, بۆیە ئەگەر هۆسرەل بە خودی

ئامادەو قسەکەرگریٚ بدەین, ئەوە دووچاری نـاودژی نابینەوە0
دەشی بەریٚگەیەکەیگاڵتەئامیٚزانە بڵـیٚن کەقـەدەری خود بۆ خۆی مانایە0 ئەو دەکەویٚتە ژیٚر ئەوەو دەڵیٚ کـە مانـا هەڵدەلوشـیٚ, مانـا بەرلەقسـەکردن دیٚ, خودییە, بۆ یەکەمجارو هەتا هەتایـە لەشـویٚنیٚك کـە پیٚـی دەڵـیٚن ئاگـایی چەسـپاوە, بـەڵام لـە توانـای مرۆڤـدا هەیـە,کـە بـەپیٚی ویسـتی خـۆی ئامـادەی بکاتەوە, وەك چۆن بەندەی خوا لەکاتی نویٚژ کردندا خوای خۆی ئامادە دەکاتـەوە, دەتـوانیٚ بـەرەو قسـە کـردنو زمـان بیگوازیٚتـەوە, ئـەوەش لای هوسـرەل وەك کاریٚکی لاوەکی دەمیٚنیٚتەوە, وەك جۆریٚـك لـە پیسبوون, ئەگەر زمـانیٚکی ئـایینی"ئیبـۆخی" بـە کاربهیٚنین, بە ناودژی ئەو دەگەریٚتەوە, ئیبۆخی یان

کورتکردنەوەی فینۆمینۆلۆژیا, کە نوێنەراتی لە دنیا دەرچوون دەکات, مەعریفە هەروەك بوون لە نێوان دوو کەوانە دادەنێ. میتۆدێکی دیکەی فینۆمینۆلوژیای ترانسندنتالی کورتکردنەوەی وێنەیە, هەرلەو ریگەیەشەوە دەکرێ هێلێکی
راست و چەپ بە سەر بوونی شتەکاندا بنێین, حەقیقەتی هەموو ئەوەی کە کاتیو هەستپێکراوە لەبەرژەوەندی بۆچوونی تەواوی جەوهەرییەت دایە.

دەشێ بوونی دنیا لە پێناو دەستگرتن بە سەر جەوهەری دنیادا رەشبکەینەوە"کەواتە واپێدەچێ فینۆمینۆلۆژیا زانستێکی بەراییانە بێ. پێش وجود , پێش تەواوی یاساکانی واقیع" نوێنەرایەتی جەوهەرو یاساکانی بکات"فنێۆمنێۆلۆژیای

**ترانسندنتالی" جۆرێکە لەتێرابوونی ناوەوەو خود, ئاگاییەکی رەهایە, رەشکردنەوەی دنیای دەرەوەیە, لە وشەی ئەفلاتوونییەتدا. لە دووتوێی ئەو فەلسەفەیەدا ئاگایی بەرهەمی سروشت نییە. بەڵکو لە هەموو سروشتێك ئازادە, لە هەمان کاتدا ناشێ سروشت لە نێو ئەو فەلسەفەیەدا نادیار بێ. هۆسرەل لەم بارەوە بە روونی دەڵێ: ئەگەرهەموو عەقڵمان لە دنیا رەشکردەوە, سروشتیش وجودی نامێنێ, بەڵام ئەگەر سروشتمان سڕییەوە, ئەو کاتە شتێك لە ژیاندا دەمێنێتەوە ئەویش عەقڵە, عەقڵی تاکخواز.**

**ئەو دیدو بۆچوونە بۆ سروشت لاوەکییەو پاشکۆی عەقڵە, هەروەها جیاوازی فینۆمینۆلۆژیاو زانستی**

دەلالەتی تەقلیدی روون دەکاتەوە, کە تەنها وشەی قبولە, کە بۆ بابەتێکی واقیعی دەگوازرێتەوە.

چەمکی ناوەندێتی لە فەلسەفەی هۆسرەلیدا دەستەواژەیە, دەستەواژەش دابەشی ئاماژە (چ مادی بێ یان دەنگی بێ, یان نووسینئامێز بێ)و مانا دەبێ. هەروەها هۆسرەل جیاوازی لە نێوان دوو جۆر لە ئاماژە دەکات: دەستەواژەو ئاماژە یان ئیشارە.

ئاماژەی یەکەم مانادارە, لە هەمان کاتدا ئەوەی دووەم ئاماژەی ئیشارییە. دریدا ئەو جیاکارییە وەك سیستەمێکی میتافیزیکی دەبینێ کە قەبولی گەیشتن ناکات. دریدا دەڵێ: هەر تەنها ئەو کاتەی کە وەزیفەی گەیشتن دەسڕینەوە, وەزیفەی وجودی تەعبیری پەتی بەدەردەکەوێت(....) بۆ ئەوەی کە

**دەستەواژەی جێگیر بکەین, دەبێ هەموو ئاماژەکانی دیکە بسڕینەوە.**

**لێکۆڵینەوەی لۆژیکی بە نیسبەت دریدا ناوکی تەواوی فینۆمینۆلۆژیایە. دریدا لە کتێبەکەیدا (دەنگو دیاردە) وەك چۆن هۆسرەل لە ئاماژە گەیشتووە, ئەویش بە هەمان شێوە لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی لۆژیکییەوە چارەسەری گیروگرفتی دەستەواژە دەکات. دریدا وەك دەبینین بونیادی میتافیزیکی تیۆری مانای لای هۆسرەل کەشف کردووە, هۆسرەل بۆ خۆی لە کتێبەکەیدا "لێوردبوونەوەی دیکارتیانە" جیاکاری لە نێوان میتافیزیکای ئەسڵی یان فەلسەفەی بەرایی‌و میتافیزیکی تەقلیدی (کە خیانەتی لە عەقڵ کردووە) دەکات.**

فینۆمینۆلۆژیا بە تیۆری هەستی و حدسی دادەنرێ, بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا عەقلاّنیشە, دژی هەموو شێوەیەکە لە شێوەکانی میتافیزیکی, بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا پێیوایە کە فینۆمینۆلۆژیا نابێتە جێگای پرسیارکردن, هەروەك نابێتە عەقڵی ترانسندنتالی, هەروەها نابێتە زمانێکی تەقلیدی بۆ ئەو عەقڵەو دەڵێ لە نێوان زمانی تەقلیدی(یان زمانی میتافیزیکی تەقلیدی) و زمانی فینۆمینۆلۆژیدا هیچ شێوەیەك لە شێوەکانی دابڕان بەدی ناکرێت.

هۆسرەل وەك بوونەوەرێکی عەقلاّنی تەماشای زمان دەکات. ئەو درك بە جیاوازی نێوان زمان و لۆژیك ناکات. ئەگەر شێوازی فوکۆیی بەکار بهێنین, دەڵێین ئەو تەنها ممارەسەی زمانی جەدەلی

دەكاتو وەك هۆكار سەیری زمان دەكات, یان بە زمانی دریدا ئەو جیاوازی لە نێوان گراماتیكو لۆژیك ناكات, گراماتیكی لۆژیكی لە سەر ئاگایی دادەمەزرێنێ, ئەسڵیش لە ئاگاییدا هەڵدەگەڕێتەوە.

گراماتیكای میتافیزیكەی ئاگاییەو لە تاكە شتێك زێتر تەعبیر لە هیچی دیكە ناكات ئەویش ئامادەگییە, یان بە زماتێكی دیكە دەنگە, دەنگی فینۆمینۆلۆژی نابێ لەگەڵ دەنگی فیزیكی تێكەڵی بكەین, چونكە دەنگێكی ترانسندنتالیو هەستییە, ئەو دەنگە رۆحێكی هەیە كە بە دنیاوە پەیوەست نییە, لە بەشی یەكەمی(دەلیلو ئەدلە)ی دریدا كە پێشتر قسەمان لێكرد واپێدەچێ كە دریدای فەیلەسوفی فەرەنسی قسە لە سەر چەمكی

ئاماژە یان دەلیل لە لای هۆسرەل بکات, هۆسرەل پێیوایە کە هێندێ ئاماژە مانادار نین, ئەویش ئەو ئاماژانەن کە پیاو بە ئاماژەی ئیشاری یان بەکورتی لە بەرامبەر دەستەواژەدا بە ئیشارە ناویان دەبات, ئیشارە سەر بە دنیایەکە, دنیایەك کە لە دەرەوەی ئاگاییو لە دەۆەوەی منو خودی قسەکەر دایە. لە بەرامبەر ئەویش دەستەواژە مانایە, ڕووداوێکی هەستتیە "ئیرادەی گوتنە".

دەشێ ئەو ئەنتۆلۆژییە زمانەوانییە بەو خشتەیەی خوارەوە ڕوون بکەینەوە:

| ئاگایی | دنیا |
|---|---|
| دەستەواژە | ئاماژە |
| (مانا, ئیرادەی گوتن,خود, | |

**عەقڵ, بابەتخوازی میسالیانە)     (نایەوێ هیچ شتێ بڵێ)**

**حەقیقەت                     ئەمبریقی**

**دواتر هۆسرەل روونی دەکاتەوە کە دەستەواژە ئیشارە نییە بۆ شتێك, ئاماژەکردن نییە بۆ وجود, ئەگەرچی بەردەوام بە گوتاری گەیشتنەوەش پەیوەست بێ, ئەو گەیشتنە هەمیشە بە نیسبەت هۆسرەل رووەکی دەکەوێتەوە.**

**دەستەواژە ئەسڵی خۆی لە دەرەوەی کرداری گەیاندنو بونیادی ئاماژەوە هەڵدەگرێتەوە, لە دەرەوەی دنیادا, لە دنیایەکی میسالی مەنەلۆگئامێز.**

**فینۆمینۆلۆژیای ترانسندنتالی رێگە بە ئاڵوگۆڕی قسەکردن نادات, چونکە گەیشتن وەك کردەیەکی**

رووەکییانە سەیر دەکات, ئەسالّەتی هەمیشە لە ونبوونی ئەوانیدکەوە جێبەجێ دەبێ, لە ونبوونی جیاوازیدا, لە جیهانی دوورەپەرێز لە رۆح.

ئەو خشتەیەی خوارەوە ئەو مەسەلە روون دەکاتەوە:

| خودی قسەکەر | ناوەندیاری فیزیکی | خودی گوێگر |
| --- | --- | --- |
| نیازی قسەکەر | دەستەواژەی ئیشارە | درککردنی |
| لەگەلّ ئاماژەی | ئەمبریقییەوە هەیە,نەك | پەیوەندی لەگەلّ خود |
| یان ئیرادەی گوتن. | | |

دەستەواژە لە دیدی هۆسرەلدا "بەرجەستەکردنە".
تەعبیر لە مانای هەبووی بەراییانە دەکات, هەروەك دەستەواژە وەك رواڵەت یان وەك بەرجەستەکردنێکی ناوەوە درکی پێدەکەین. بەرجەستەکردنو رواڵەتی دەرەوە سروشت نییە بەڵام مانایە, دەنگی خودی قسەکەرە, لای هۆسرەل بونیادی گوتارەو میسالییە, دالێکی میسالییە, قبولی گۆڕانو مەدلولی میسالی ناکات, میسالییە بەڵام نەك بەو مانایەی بەردەوام بتوانێ خودی ئامادە بەرهەم بهێنێ.

بوون لە دیدی هۆسرەل وەك چۆن دریدا روونی کردۆتەوە دووبارەکردنەوە, یان پرۆسەی بە ئامادە بوونە, ئەو بە وێناکردنەش بە بۆچوونی من دەلالەت لە هەرەمییەتو دوا سیستەمی هۆسرەلی

دەکـات, چـونکە سیسـتەمەکەی ئـەو سیسـتەمێکە هـەر تـەنها خـۆی لـە نکـۆڵی کردنـی گەیشـتندا هەڵناگرێتـــەوە, بـــەڵکو بـــوون لـــە ئەســـڵێکی دیاریکراودا دەشارێتەوەو لە شـوێنێکی دیـاریکراو رووتی دەکاتەوە.

دریدا دەڵێ گەشەی مێـژوو لای هۆسـرەل, بـەردەوام شـێوەیەکی سـەرەکییانەی لـە خـۆدا هـەڵگرتووە, ئـــەویش پێکهاتـــەی میســـالیانەیە, وەك ئـــەوەی دووبارەکردنـــەوەی تەقلیـــد بـــێ و هـــەتا هەتایـــە پارێزگـــاری لێبکـــرێ و بـــەردەوام لـــە دووتـــوێی دووبارەکردنەوەو لاسایکردنەوەدا بسـورێتەوە, واتـە گواستنەوەو نوێکردنەوەی ئەسڵ. دیاریکردنی بوون وەك ئەوەی کە میسـالی بـێ, نرخانـدن و کردەیـەکی ئەخلاقییانـەی-تیۆرییـە, دان بـە حـوکمی ئەسـڵی

فەلسەفە دادەنێ لە شێوە ئەفلاتوونییەکەیدا, دەنگیش تەعبیر لەو ئامادەگییەو لەو شێوە ئەفلاتوونییە دەکات.
دریدا دەپرسێ بۆچی دەنگ لە نێوان ئاماژەکاندا لە هەمووان میسالی ترە؟ لە کوێوە ئەو بەرزو نزمییە لە نێوان دەنگو میسالییەتدا پەیدا بووە؟. ئەوە ناوکی پرسیاری ئەو کتێبەیە لە ڕێگەی ئەو پرسیارەشەوە, دریدا دەیەوێ پەیوەندی نێوان سێنترالیزمی دەنگیو سێنترالیزمی عەقڵی هەڵوەشێنێتەوە, دریدا دەیەوێ روونی بکاتەوە, کە پەیوەندی نێوان دەنگو ئاگایی پەیوەندییەکی ناوەکییە, دەنگ وەك بەندەی (من) دەمێنێتەوە, هیچ شوێنێك بۆ ئەویدیکە ناهێڵێ, هیچ شوێنێك بۆ دنیا ناهێڵێتەوە, خودی دالو مانای مەدلول

**تەنیا یەکێك‌و هاوشێوەو منـە, واتـە هـەمان شـتن, ئێستا لێرە لەو کاتەی کە قسە دەکەم, گوێبگرە کە چ دەڵێم, مـن خودی خۆم وەك ئامـادەگی پراکتیـزە دەکەم, وەك نەفس‌و ڕۆح, ژیانم قایم دەکەم.**

**دریدا لـە (گراماتۆلۆژیـا)دا ئامـاژە بـەوە دەدا کـە مێـژووی میتافیزیکـا نـەك هـەر لـە ئەفلاتوونـەوە هەتا هیگڵ, بەڵکو لە پێش سوقرات‌و هەتا دەگاتە هایدگـەر بـەردەوام عـەقڵ وەك ئەسـڵی حەقیقـەت تەماشا دەکات, ئەو بۆچوونە هەمیشە وەك شتێکی لاوەکی‌و تەکنیکی سەیری نووسـینی کـردووە, لـەم دیـــدەوە هەمیشـــە نووســـین دەکەوێتـــە دەرەوەی واقیعـەوە, بـەڵام دەنـگ بـە پێچـەوانەی نووسـینەوە پێکهاتەیەکـــە, لـــە پێکهاتـــەکانی ئـــابووری میتـافیزیکی, ئـەو دالەیـە, کـە ناکەوێتـە دنیـای**

ئەزموونەوە, بۆ خۆی خودی ئاگاییە, نووسین نە مانای هەیەو نە کاریگەری, بۆیە دەشێ وازی لێبهێنین, چونکە میتافیزیکا پێویستی بە جەستە نییەو نێرگزییە, جۆرێکە لە گوێگرتن لە خود.

دەنگو بوون دەکەونە نێو پەیوەندی لێکنزیکبوونەوەوە, دەنگ وەك هایدگەر دەڵێ لە رۆحەوە دەرژێ, نووسین لەو دیدە میتافیزیکییە جگە لە ناوەندیارێك زێتر شتێکی دیکە نییە, نە هەڵگری حەقیقەتەو نە ئیرادەی گوتنی پێیە, بەڵکو هەر تەنها دەلالەت لە بەرجەستەکردن دەکات.

دریدا روونی دەکاتەوە, کە چەمکی نیازئامێز بۆ خۆی بەندەی میتافیزیکای ئیرادەیە....ئیرادەی گوتنیش تەعبیرکردنە لە ئامادەگی, هەموو ئەوانەی کە دەکەونە دەرەوەی خودو ئیرادەوە, وەك

زمان‌و جه‌سته‌و سروشت به بێ مانا ده‌كه‌ونه‌وه, دووانه‌ی (عه‌قڵ/جه‌سته) رۆڵێكی تایبه‌تی له تیۆری مانای هۆسره‌لیدا ده‌گێڕن.
عه‌قڵ ئیراده‌و مانایه, به‌ڵام جه‌سته له هه‌موو مانایه‌ك رووت بۆته‌وه, مردنه. دریدا فینۆمینۆلۆژیا وه‌ك كه‌مكردنه‌وه به‌ره‌و مه‌نه‌لۆگ ده‌بینێ‌و ده‌ڵێ له ژیانی رۆحی دووره په‌رێزدا پێویستمان به وشه‌ی واقیعی نابێ, به‌ڵكو هه‌ر ته‌نها پێویستمان به وشه‌ی خه‌یاڵی ده‌بێ.
ئاماژه له فه‌لسه‌فه‌ی كلاسیكی وه‌ك چۆن له زانستی زمانه‌وانیدا جۆرێكه له پاشكۆ یان یارمه‌تیده‌رو هیچ په‌یوه‌ندی به حه‌قیقه‌ته‌وه نییه, ده‌شێ له كاتی قسه‌كردن له باره‌ی حه‌قیقه‌ته‌وه وازی لێبهێنین. ئاماژه یان زمان هه‌ر ته‌نها

ڕەنگدانەوەی حەقیقەتی میسالییە, کە لە دەرەوەی دنیاوە دادەمەزرێ. زمان یان ئاماژە هەڵگری هیچ مانایەك نییە, چونکە وجودیان لە دنیادا هەر تەنها وەك جەستە پراکتیزە دەبێ, ئەو تێگەیشتنە بۆ ئاماژە, هۆسرەل بەرەو ریسوابوونی (گەیشتن) دەبات, ئەوەی دوایی بە نیسبەت ئەو ترسناك دەکەوێتەوە, چونکە جێگیرکردنی مانای ئەسڵی پێیە, ئەوەی دوایی چ وەك ئاماژە بێ, یان وەك نووسین, یان وەك مرۆڤ و سروشت بێ, بەردەوام لە فەلسەفەی هۆسرەلدا بە لاوەکی تەماشا دەکرێ و جۆرێکە لە پەراوێز.

دەتوانین هەڵوەشانەوەی فەلسەفەی ئامادەگی وەك چۆن دریدا پێی هەڵساوە لە چوار خاڵی سەرەکیدا کورت بکەینەوە, کە ئەوانەن:

1-دریدا پێیوایە کە ئاماژە هەر تەنها ڕەنگدانەوەی مانای ئەسڵی نییە, بەڵکو مەرجی تواناکانی ئەو مانایەشە, کە لە خۆیدا هەڵیگرتووە, هەروەها هەر کردەی ئامادەبوونی مانای دروستکراوی پێشووش نییە.

2-دریدا کورتکردنەوەی زەمەن لە ئێستا تەجاوز دەکات, ئێستا یان هەنووکە وەك نوێکردنەوەیەکی ئەنتۆ-لاهوتییانەی وجودە, وەك ئەسڵی حەقیقەتو دروستکەری مانا, ئەوەش بە نیسبەت دریدا شێوەیەکە لە شێوەکانی ئەفلاتوونییەت.

3-دریدا تەجاوزی هێرمینۆتیکای تەقلیدی دەکات, کە بەردەوام خۆی بە خاوەنداری مانای ئەسڵی دەژمێرێ, ئەو هێرمینوتیکایە لە سەر تێگەیشتن دروست بووە, نەك لە سەر جیاوازی, لەو

بۆچوونەدا ونبوون رۆلێکی سەرەکی لە پێکهێنـانی مانادا دەگێڕێ.

<u>**تێبینی**</u>

**ئەو نووسینە نووسوری مەغریبی (رەشید بوتـەیب) نووسـیوویەتی لـە ئینتـەرنێت وەرگـێراوە بڕوانـە گۆڤاری ئەلواح ژمارە (17)ی (2004). مـن بـە پێویستم نـەزانی سەرچـاوەو پـەراوێزەکانی نووسـەر بنووسمەوە.**

**کاریگەری بونیادگەری لە سەر فەلسەفە**

**فەلسەفەی بیٚ سێنتەرلای دریدا**

**لەم دواییەدا کتێبی ((مێژووی پلیتی پۆستە- کارت پۆستال لەئەرستۆوە))ی جاك دریدا کەئوستادە لە خانەی بالاٚی مامۆستایان لەپاریس کەوتە بازاڕەوە(پۆل رێکۆر) کە چاوی پێکەوت پرسی: چ پێویستیەك پالّی نای بۆ نووسینی کتێبێکی ئاوها؟(دریدا) بەجۆرە وەلاٚمی دایەوە:**

تۆ کاتێك چەمکی(پێویست) بەکار دەبەی، ئەوە لە دووتوێی مەرکەزییەتی عەقڵدا لەنێو عەقڵانیەتدا دەمێنیتەوە، بەڵام من لەمێژە لێی دەرباز بووم، هەرچۆنێ بێ ئەو وەڵامە (ریکۆر)ی رازی نەکرد.

ئەوەی زانراوە(پۆل ریکۆر) کە پرۆفیسۆری گشتی فەلسەفە بوو لە(سۆربۆن) ئەو کات (درێدا) وەك (موعید) لای ئەو کاری دەکرد. هەروەك لەو نووسینەدا بەدەردەکەوێت، ئەو دیالۆگە کورتە، دەلالەتی گەورەی لە خۆدا هەڵگرتووە، بەو مانایەش ململانێی دوو قوتابخانە، یان دوو نەوە دەنوێنێ، خودی ئەو دوو فەیلەسوفەش دوو تەوەری دژ بەیەك بوون، لەدوایین کۆنگرەی کۆمەڵەی فەیلەسوفانی فەرەنسی کە لە(7-10) مانگی تەمووزی(1980) لەشاری سترا سبۆرك بەسترا.

ئەو دوو فەیلەسوفە(بەلای کەمی) لەم کۆنگرەیەدا دوو شتی دژیان لە هۆشی رێکخەری کۆنگرە و تەواوی بەشدار بوواندا کێشا. دوای ئەو سەرەتا خێرایە هەوڵدەدەین، لەو نووسینە کورتەدا کاریگەری بنەڕەتی بونیادگەری لەفەلسەفەدا دیاری بکەین، پاشان هەندێ روونکردنەوە(دەخەینە روو سەبارەت بەو فەلسەفەیەی کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری بونیادگەری و بانگەشەی دنیایەکی بێ سێنتەر و بێ پاڵپشت دەکات، واتە بڕوای بەدەسەلاتی رەهای ناوەندێتی عەقڵ و رۆڵی وشە نییە، ئەویش فەلسەفەی دریدایە، پاشان هەوڵدەدەین دەلالەتە بنچینیەکانی ئەو فەلسەفەیە روون بکەوینەوە.

**لەنێوان بونیادگەری و فەلسەفەدا**

پرسیار کردن لەپەیوەندییەکانی زانست و وفەلسەفەو کاریگەری ئەوییان بەسەر ئەمیاندا گرنگ و رەوایە، بێ ئەوەی بکەوینە درێژ دادڕییەوە دەتوانین بڵێین هەر لەسەدەی حەڤدەهەمەوە، لەو کاتەی کە زانستە وردەکان لە بۆتەی فەلسەفەدا رزگاریان بوو، بەدوای ئەویشدا دەرچوونی زانستە مرۆڤایەتیەکان لە دەسەڵاتی باوکانەی فەلسەفە، دوور کەوتنەوەی لەودەسەڵاتەوە، ئەوەی دوایی راستەخۆ دەکەوێتە ژێر هەموو ئەو نوێکاریانەی کە زانست، یان زانستە مرۆڤایەتیەکان پێشکەشی دەکەن، ئەو نوێکاریانەی کە زانست ،یان زانستە مرۆڤایەتیەکان پێشکەش دەکەن، ئەوەش فەلسەفە بەردەوام پێویستی پێیەتی، چونکە پاکانە بۆ

وجــودی دەكــات، و كايــە تايبەتيــەكانی ديــاری دەكــات، ئــەويش هەميشــە وا هەســتدەكات كــە بەخششــە نوێكــانی زانســت بــەرەنگاری ئــەو بەردەوامبوونــە دەبنــەوەو دەيخەنــە هەڵوێســتی گومــانلێكراوی تاوانبــارەوە، هــەروەها فەلســەفە لەســەرييەتی ئــەو شــتە نوێيانــە رەچــاوبكات كــە زانســت و زانســتی مرۆڤايــەتی دەيخەنــەوە، تــاكو بتوانێ وەك كوڕی شارستانی و نـەوەی زەمانەكـەی بمێنێتەوە.

لــەو چــەرخەماندا دوو زانســت لــە زانســتە مرۆڤايەتيــەكان دەســتيان بەســەر بوارەكــانی مەعريفــەدا گرتــووە و فەلســەفەی خۆرئاوايــان دووچــاری لــەرزين كــردووە، هــەروەها دەقــە سەرەكيەكانی خودی ئەو فەلسەفەيان كۆكردۆتەوە و

شیکردنەوەی دەروونی و زمانەوانیان لە بارەوە ئەنجام داوە. بونیادگەری راستەخۆ لەزمانەوانی (سوسێر) و ئەنتۆپۆلۆژیای (لیڤی ستراوس) هاتۆتە بەرهەم، واتە دەکرێ بڵێین ئەو فەلسەفەیە لە زانستی مرۆڤایەتییەوە لەدایکبووە، کەچی فەیلەسوفان هەمیشە کاریگەری میتودێکی دیاریکراو، یان تیۆرێکی زانستی دیاریکراو لەسەر فەلسەفەکانیان رەتدەکەنەوە، بەلاّم گرفتەکە لە قبوڵکردن و رەتکردنەوەدا نییە، چونکە ئەگەر ئێمە چاو لە بیست ساڵەی بوارەکانی فەلسەفە بکەین، واتە هەر لەو کاتەی کە ئاراستەکانی بونیادگەری دەستی بەسەر بوارێك لە بوارەکانی مەعریفەدا گرت، ئیتر کاریگەریەکی گشتی فەلسەفی بەدیار کەوت، ئەویش ئابوری گەڕانەوەبوو بۆ خود، واتە

پێویست بوون بەفەلسەفەیەك كە(خود ) یان(بكەر) رۆڵی سەرەكی تیا دەگێرێت. بەكورتی دەڵێین: لەسەدەی هەڤدەمدا(دیكارت) پێویستی بە زەمانەتی خودایی بوو، تاكو دڵنیا بێ لە راستی ئەوەی كە دەیبینێ، واتە ئەوەی زەمانەتم بۆ دەكات، كە ئەوەی دەیبینم خودی ئەو شتەیە كە دەیبینم، نەك دەستكردی ((درِندەیەكی بلیمەت)) تام لە دەسخەرۆ كردنم وەرگرێت، ئەوەش كەماڵی بایەخ پێدانی خواوەندە، ئەو كەماڵەش ناهێڵێ ببمە قوربانی یارییە گلاَوەكان((خودی ئەو پرسیارە فەلسەفییە لە فەلسەفەی عەرەبیدا((غەزالی تەعبیری لێكردووە)).

(ئەدمۆند هوسرەل)ی ئەڵمانی لە ناوەراستی ئەو سەدەیەدا هات، تاكو بە فینۆمینۆلۆژیاكەی لەم

بارمتەیەی خواوەند رزگارمان بکات، لەبری ئەوەش کۆمەڵێك ئەزموونی خودی، یان کۆمەڵێك خود-یان خودێك و خودی ئەویدیکەی هێنا ئاراوە، هەروەها ماهیەتی کۆتایی خستە نێو دووکەوانەوە، واتە وازی لە لێکۆڵێنەوە هێناو تەئکیدی لەسەر پێکەوە ژیان کرد، واتە ئەزموون، کە ئاگای خودی تیا دەژیت، یان تاقیکردنەوەیەك کە ئاگای خودی تیایە، بونیادگەریش هات تاکو بەرێگەی ئابورییەوە ئەو ماوە نوییە ببڕێت بۆیە ئەو جارەیان وازی لەخود هێنا، واتە لەو فەلسەفەیەی کە بەشێوەی قسە کردن لەگەڵ ئەویدی دەنوسرێت، ئەوەش بۆ فەلسەفەی (دیکارت)ی پشت بەست بە کۆجیتۆکەی لێدانێکی کاریگەر بوو. ئەگەر فەلسەفەی(دیکارت) دەڵێ(من بیردەکەمەوە کەواتە

هەم) بەكەفالەتی خواوەند ئەوەی دەیبینم هەروەك خۆی دەیبینم ئەوە فینۆمینۆلۆژیای (هوسرەلی) دەڵێ من بیر دەكەمەوە,تۆ بیردەكەیتەوە، ئێمە گشتمان بیردەكەینەوە. ئەوەی لێرەدا گرنگ دەكەوێتەوە بۆ ئەزموونەكانمان ژینكارییە لە ئاگایی خوددا. كەواتە ئێمە لەگەڵ بونیادگەری و فەلسەفە نزیكەكانیدا دەڵێین، یاخود ڕاستی ناڵێین، چونكە وشەی دەڵێین خۆی لە خۆیدا گەڕانەوەیە بۆ(خود) بەڵكو بڕیاردەدا: لەناوەوەمەدا بیر دەكاتەوە، ئەوەش(بونیادە) گرنگیش بەدیارخستنی ئەو بونیادەیە.

گوتمان فەلسەفە دەكەوێتە ژێر كاریگەرە نۆیكارەكانی زانستی و زانستی مرۆڤایەتییەوە ئەوەتا(پۆل ریكۆر) لە كتێبەكەی(ململانێی

هێرمونتیکا) لە ڕێگەی دوور و درێژو پێچاوپێچی زانستە نوێیەکانی مرۆڤایەتییەوە لە(کەینونەت) دەکۆڵێتەوە ڕەخنە لە(هایدگەر) دەگرێ کە ڕێز بۆ ئەو یاسایە دانانێ، واتە(هایدگەر) هەوڵدەدات جۆرێك لە ئەنتۆلۆژیای ڕاستەوخۆ بسازێنێ بڕوانە: R.Ricoeu: Leconflitdes inter Pretationepp.257.262) ئەو کاریگەرییە بایەخدارە کە لەبونیادگەری دەبینرێت لەسەر ئاستی فەلسەفەی کۆجیتۆیە کە واز لە (خود) دەهێنێ، لەچەمکی ئەپستمی(فوکۆ) و چەمکی فەلسەفەی بێ سێنتەری (دریدا) دەبینین. فوکۆ لە کتێبی(وشەکان و شتەکان) کە لە ساڵی 1966 دەرچووە، هەوڵدەدات ئەو بارودۆخە پارچەپارکراوە ببینێ کە لە دووتوێی بوارە

مەعریفیەکانـــدا پارچـــەی دیـــاریکراون و دەبنـــە پێکهێنەری ئەو مەرجانەی کە دەکرێ(فوکۆ) تیاندا بڵـێ: گوتارێـك دانـی پیـادەنرێ کـە حەقیقـەتی شتەکانی تیا رەنگداداتەوە، بە واتایـەکی دیکـە لـە هەموو کاتە مێژووییـە دیاریکراوەکانـدا (پێشـینە) هەیە و بنچینەی مەعریفەیان لەسـەر بونیـاد نـاوە، گەڕان بەدوای هەموو ئـەو پێشـینانەش((پێشـینەی مێژووی) پێکدەهێنێ.

کەواتـە لێـرەدا سیسـتەمێکی شـاراوە لـە پشـتی دیاردەکانـــەوە هەیـــە، کـــە مـــەرجی حەقیقـــەت پێکـدەهێنێ، بـێ ئـەو مەرجـەش نـاکرێ هـیچ گوتارێـك لـە ئـارادابێ. کـە حەقیقەتـەکانی تیـا رەنگبداتەوە، یان راستر وەك گوتارێکی هاوچەشـنی راستی دانیپدانییێت(بڕوانە وشەکان وشتەکان فوکۆ

ل171) فوکۆ خودی ئەو چەمکەی کە لەبارەی مەعریفە، یان(ئەبیستم) لەسەر تازەگەرێتی پراکتیزەی دەکات و تەئکید دەکات کە لەناوەڕاستی سەدەی رابردوو، گرنگ بوونی((کوفییە- بایۆلۆژی و پۆپ- زمانەوانی و رێکاردۆ- ئابووری)) نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە سەردەمی ئامادەیی دیاریکراوی مەعریفە هاتووە لەیەك کاتیشدا مێژووی ئابوری کۆتایی بوونی مرۆڤایەتی و کۆتایی مێژوو لە ئاسۆ هاتووە(بڕوانە هەمان سەرچاوە ل274) بەمجۆرە وادەردەکەوێت کە ئەرکیۆلۆژیای مەعریفە لای(فوکۆ) بەتەواوی وازی لە (خود) هێنابێ تاکو لەبری ئەوەش باردۆخێ دەهێنێتەوە کە پێشینەی مێژووی دروستی دەکات وهۆی حەقیقەتی هەموو مەعریفیەیەکە.(جاك

دریدا )ش لەفەلسەفەکەیدا واز لە گەڕانەوە بۆ(خود )
دەهێنیّ و ناویشی دەنیّ(فەلسەفەی بیّ سێنتەر)
هەروەك لیّرەدا روونی دەکەینەوە.

فەلسەفەی بیّ سێنتەری جاك دریدا

(جاك دریّدا) هەوڵدەدا ئەو فەلسەفەیە رەش بکاتەوە کە لە سەر خود وەستاوە، لەدێکارتەوە بۆ خۆرئاوا بەجیّ ماوە، لەراستیدا دریّدا لەو هەولّەیدا دوور دەچیّت ئەگەر بیەویّت تەوەرەی سەرەکی رەش بکاتەوە ئەو تەوەرەی کە تەواوی میتافیز یکای لەسەر بونیادنراوە، ئەوەش مەرکەزییەتی ئەقلّە, یان کۆنترۆڵکردنی ئەقلّ و وشەیە لە خالّێکی سەرەکی, خالّێك کە بە شوێنی گەڕانەوەی هەموو فەلسەفە و حەقیقەتەکان دادەنریّ. هەموو فەلسەفەکان لەسەر ئەقلّ, یان لۆگۆس ڕاوەستاون, کە دوا بنەڕەت و

زەمانەتە بۆ حەقیقەتەکان. دیداش بۆ ئەو سەرچاوە پتەوە هێرش دێنێ تاکو دڵێنابێ. لێرەدا دواین سەرچاوە بۆ گەڕانەوە لە ئارادا نیە تا حەقیقەتە فەلسەفیەکان دەستەبەر بکات, یان تاکو بێتە زەمانەتی حەقیقەتە فەلسەفیەکان, هەموو فەلسەفیەکان لە ڕاستیدا فەلسەفەی مەرکەزی عەقڵ بوون, هەموو ئەوفەلسەفانەش جگە لە مەرکەزیەت دانان بۆ ئەورووپاو سەیرکردنی خۆرئاوا بەتەوەرەی سەرەکی فیکر شتێکی دیکە نین, لە کاتێکدا ئێمە لە ڕاستیدا تەماشای زمان دەکەین و هەرگیز سەرنج لە بوونی مەرکەزێك نادەین کە ڕاستیە بچوکەکان وەك جەمسەر لە خۆدەگرێ, چونکە زمان لە یارییەکی گەورەی بێفەرماندە پێکدێ, ئەو یاریەش لە بنەڕەتدا یاری

**لێكجیاكانە, یاری جیاوازیەكانە, بۆیە (دریدا) بە دوای شوێنی نوێی وشەدا دەگەڕێ و لە خودی ئەو خاڵەشەوە دەست پێدەكات, تاكو مەركەزیەتی دەسەلآتی وشە وردوخاش بكات, یان بۆ ئەوەی ئەو مەركەزە دەسەلآتدارە بڕوخێنێ كە خۆی بە(بنەچە) و مەرگەزی زمان دەژمێرێ((بەر لە فەلسەفە كردن لەسەر وون بوونی وشە بیر لە بارە نوێكە بكەینەوە تاكو ملكەچ بیێ بۆ بنیاتێك كەهەرگیز هەموو شتێك نییە, یان تاكو دووبارە بۆ ژێر بونیادێك نەگەڕێتەوە خۆی بە هەمووشتێك دەزانێت, ئەو بونیادەی كەڕێگا بە كودەتای تەواو دەدا دژی وشەو ئینجا دژی هەموو (میتافیزێكی ئامادە) بووەستێ, لای درێدا ئەو بونیادە خۆی لە چەمكی جیاوازی و دابڕان, یان جیاكاری, یان یارییە**

جیاوازییەکان دەدۆزیتەوە کە (جێکەوت) بانگەشەی بۆ دەکات. ئەو بەرهەمەش مەرجی بنەڕەتی بێ شوێنی دەسازێنێ و هەموو ئەو مەدلولانەی کە بوونیان لە عەقڵەوەیە وەبەر شیکردنەوە دەدات.

ئەگەر لە رەگەزی واژەیی, واتە(پیت) دەسپێکەین, بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە دیاردەی جیاوازی و ڕەوتی کار کردنیان پێکهاتەیەکی رەسەن دادەمەزرێنن کە هیچ ڕەگەزێکی سادە لە پێش ئەودا نەبێت، یان پێش هەموو ڕەگەزێکی دیکەی سادە دەکەوێت, بەمانایەکی دیکە جیاوازی نێوان واژەو یەکێکی دیکە جیاکاری نێوان واژەیەك و واژەیەکی دیکە,ئەسڵێکە, یان ئەو ئەسڵەیە کە پاش ئەوان و دوور تر لەوان ئەسڵێکی تر وجودی نیە,

بوونی((ب)) ناکریّ((س)) بیّ, جیاوازی((س)) و ((ب)) ئەسڵی یەکەمە و بەرهەمێکە ڕووت, ئەوە جیاوازییە ڕەهاکانن, واتە جیاوازییەکان ناکەونە سەر هیچ ڕەگەزێکی هەستی جاچ ڕەگەزەکە هی(بیستن)بیّ, یان(بینین), دەنگی بیّ, یان وێنەیی, کەواتە جیاوازییەکان مەرجی بنەڕەتی وجودی هەموو ڕەگەزە هەستیەکان پێکدەهێنن و دەکەونە بەر ڕای هەموو دال و مەدلولێك و بونیادو مانایەکەوە, هەروەها هەموو ناوەڕۆك و تەعبیر کردنێك .

خودی فیکرەی جیاوازییەکان ڕێگا بە(درێدا) دەدا بەسەر هەموو گیروگرفتەکانی زماندا گوزەر بکات, تا دەگاتە لە دایکبوونی ئاخاوتن لەسەر توانای هەبوونی وێنەییەوە : هەموو جیاوازییەك

کـاری خـۆی وەك جیـاوازی لای ئـەوی دیکـە جـێ دەهێڵێ بێ ئەوەی لێـرەدا سەرچـاوە ڕاڤـەی هـەموو ئەوانــە بکــات کــە دەڕوات هــەر خــودی ئــەو جیاوازییەش دەکەوێتە پاش هـەموو مانـاو چـەمکە فەلسەفییەکان, ئەوماناو چەمکانەی پاڵ بـە چـاخی ئەنتۆلۆژی لاهوتی دەدەن, واتە ئەو پێش هەموویان دەکەوێت و ئەگـەر ئـەویش نـەبێ شـتێك لـە ئـارادا نـابێ, ئەگـەر بـەمانای((لـە دایـك بـوونی وشـە)) هەموو چەمکە خەلفیەکان بخەینـە پێشـەوە, کەواتـە خـودی بەرهـەم دەبێتـە سەرچـاوەی بنـەڕەتی, واتـە ئەسـڵێکی ڕەهـا, بـۆ هـەموو مانـاو دەلالەتـەکان, بەلاّم ئەگەر ئەو هەر خۆی بێ و ئەسڵ نەبێ, کەواتە مانا هەموو ئەو سەرچاوانەی کە بۆی دەگەڕێتەوە لە دەستی دەدات, بە کورتی هەر پیتێك بـوونی خـۆی

لە جیاوازییەکانی پیتێکی دیکە بەدەست دەهێنێ, هــەروەها هــەموو وشــەیەك ڕوونــی خــۆی لــە جیاوازییەکانی وشەیەکی دیکە وەر دەگرێت, بـەلاّم زنجــیرەی ئــەو جیاوازیانــەش بــۆ هــیچ ئەســلّێك ناگەڕێتەوە, بەلّکو ئەوە مەرجی بـوونی هـەموو دال و مەدلولێك و هەموو ئەسلّێکە, لێرەدا نـاکرێ بـە هـیچ چـەمکێکی فەلسـەفی وەسـفی بکـەین, یـان دەوری بگرین, چونکە خۆی ئەومەرجەیە کە نـاکرێ لــەو دوورتــر بــڕۆین, کەچــی بەســەر هــەموو ئــەو هەولاّنــەی کــە دەیانــەوێت زالّــە, چــونکە مــەرجی توانای هەموو چەمکێك ئەو ئەسلّەیە کە بێ ئەسلّە, بـۆ هـیچ مەرکـەزێك ناگەڕێتـەوە و لـە دەوری هـیچ مەرکەزیکیش ناسوڕێتەوە, لێرەدا هیچ جیاوازییەك نییــە ئەســلّی بــێ, یــان بــەرایی بــێ, کــە بــۆی

بگەڕێینەوە, تاكو یارییە جیاوازەكان و جیاكارەكان ڕاڤــە بكـــات, جیـــاوازی, یـــان جیاكـــاری وەك جیاوازییەكی ڕەها خۆی جێگیر دەكات, واتە دەبێتە جیاكارییەك, یـان جیاوازییـەك كـەناكرێ یـەكێكی دیكە بێت, خودی ئـەو ئەسـڵە, كـە ئەسـڵی نییـە و بەهیچ چـەمكێك دەورە نـەدراوە, دەبێتـە چـەكێكی ترسـێنەر كـە(درێـدا) بـۆ ڕووخـان و تێكشـكانی هـەموو فەلسـەفەكانی خۆرئـاوا بـەكاری دەهێنـێ, ئەگەر نەڵێین گشت بەخششەكانی ئەقڵ .

لە ڕاستیدا(درێـدا) بەپرۆسـەی ڕووخـان هەڵناسـێ, بـــەڵكو بەپرۆســـەی شـــیكردنەوەو بەیەكداكێشـــان هەڵدەسێ, یاخود بنەچەكان دژبەیەك دەكاتـەوە كـە هەموو فەلسەفەی لە سەر هەڵچنراوە, بونیادی ئـەو فەلسـەفەیەش هـەر لـە خـودی خۆیـەوە بەیـەك

دادەكێشـــن, فیكـــرەی بەرهـــەمیش لـــەلای ئـــەوی تر(پیت) جێ دەهێڵێ, یان لای ئەوانیدیكـە(وشـە) دەخاتەوە, ڕێگا بە(درێدا)ش دەدات كـە سـێنتەری سـەرەكی هـەموو فیكرەیـەك بگوازێتـەوە, بـەڵكو ڕاسـتتر هـەموو خـاڵێكی جـێگیر بـوونی فیكـرەی مرۆڤایـەتی رووت بكاتـەوە, هـەر لێـرەدا هـەموو گیروگرفتـەكان حەقیقـەت و مەعریفـە و ئەسـڵی یەكـەم لــە ئاســۆ ڕەش دەكاتــەوە, تــاكو لــە بەرامبەرمانـدا دنیایـەكی بـێ بـەری و تـەواو بـۆ ڕاڤەكردن بهێنێتەوە .

لـە خـودی ئـەو فەلسەفەیەشـدا, یـان راسـتتر لـە بۆچوونی شتەكان دەبینین هـەموو گەڕانەوەیـەك بـۆ مرۆڤ وەك بكەروو تـەوەرەی فیكـر ون دەبێـت, واتـا فەلسەفەی خود لەناو دەچێت و لـە شـوێنی ئـەویش

بونیادی سەرەتای و بونیادی یارییە جیاوازەکان و جیاکەرەکانی نێو زمان دادەمەزرێ, لێرەدا مەغزای دیالۆگی نێوان درێداو ریکۆر لە نێو نووسینەکانماندا دەردەکەوێت .

## دەلالەتە بنەرەتیەکانی فەلسەفەی درێدا

دوای خستنە بەر چاوێکی خێرای ئەو فەلسەفە رەسەنە, سەرەڕای ئەوەی نکۆڵی لە هەموو ئەسڵ وئەساڵەتێك دەكات, ئێمە پرسیار لە مەغزای خودی فەلسەفە دەکەین, چونکە سەرەڕای ئەوەی(درێدا) نکۆڵی لە خۆرئاوا دەكات کەچی فەلسەفەکەی بە گەشەسەندنەکانی خۆرئاواوە پەیوەستە, لێرەدا بەکورتی ئاماژە بەوانەی خوارەوە دەکەین:-

**أ-چەمكی جیاوازی, یان جیكاری وەك بنەڕەت لە زماندا هەر لە سەرەتاوە(سوسێر) ئاماژەی پێكردوە و تەئكیدی لێ كردوە, دەڵێ: لەزماندا جگە لە جیاوازی هیچ لە ئارادا نییە بڕوانە(Cours.P.160). كەواتە كاریگەری زمانەوانی لەسەر فیكری درێدا بە روونی دیارە .**

**ب-هەوڵەكانی درێدا وادەردەخات كە ئەزموونەكانی عەقلانیەتی خۆرئاوا لەوپەڕی بەخششەكانی دایە, كەچی فەیلەسوفەكان لە سەرسامیدا مانەوە, بەجۆرێك ئەو ئەقلانیەتە نەیتوانی داواكراوەكانی بخاتە ڕوو, كەواتە بۆ كۆمەڵگای خۆرئاوا كۆمەڵێك گیروگرفتی نوێ دەسازێنێ كە ئالۆزییەكانیان لە هی پێشوو كەم تر نابێت .**

**ج-خـــودی فەلســـەفەی دریـــدا هەوڵدانێکـــە بـــۆ دەرچوونی لە قاوغی فیکرەی ئـەقلانیتی خۆرئـاوا, کـە وەك تـەوەرەی بنـەڕەتی پشـت بـە(لۆگـۆس) دەبەستێ, بەڵام ئایا دەکرێ ئەقلانیەت تێپـەڕێنرێ؟ ئایا خۆرئـاوا ئـەو کاتـەی ئێمـە داوای سـەروەری لێ دەکەین لەئەقلانیەت بێـزارە, گومـانی تێدانیـە کـە فیکرەی(درێدا) پەیوەستە بە فیکـرەی(نیتشـە) بـە تایبەتی لە فیکرەی مردنی خودا .**

**د-هایدگەر بەر لە درێدا هەوڵیـدا سـنووری عـەقڵ تێپەڕێنێ, لە بۆچوونی ئەودا پیرۆزی لەبارەی بەشـە ڕۆشناییەکەی دارستان یـان((دورگـەی دارسـتان)) ئەو ڕۆشناییە وا لە وجود دەکات نەشوەی وجود کـە مـرۆڤ تیایـدا درێـژە بـە روخسـارەکانی ئـەزموونی**

وجود بدات, هەروەها لە دووتوێیدا گیروگرفتەکانی کەنیونە چارە بکات .

ه-هەوڵەکانی درێدا دنیایەکی میکانیکی تیا ڕەنگ دەداتەوە کە ئامێرەکان تیایدا باڵادەستن, لێرە لە دنیای پیشەسازیدا هیچ پێویست بە ئامێر ناکات, یان ئاشکرا کردنی ئامێرەکانی دیکە, هەموو ئامێرێك لە جیاوازی ئامێرەکانی دیکە وەزیفەکانیان ئاشکرا دەبێ, بێ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی دیکە تاکو وجودی ئامێرەکان ئاشکرابکەین .

و-ئینجا دەکرێ لە ڕادەی ڕەوایەتی بەکارهێنانی چەمکێك بپرسین کە مەدلولاتی لە نێو زانستێك لە نێو زانستەکانی مرۆڤایەتیدا هەیە, کە چۆن دەخرێتە بواری فەلسەفەییەوە, بێ ئەوەی لەم

بەکارهێنانە نوێیەدا مانا وردکراوەکانی لە بەرچاو بگرین, هەروەها دەکرێ پرسیارێك لەو پرسیارانە بکەین کە ئایا یارییە جیاوازییەکان لە نێو زماندا بەراستی بنچینەیە, کە بنچینەی دیکەی لە پێشدا نەبووە؟ ئایا ئەو مەسەلەیە کێشەیەکی بایۆلۆژی دەرنابڕێت کە تاکو ئێستا لای زانایان لێکۆڵینەوەی لە بارەوە ئەنجام دەدرێت .

بە کورتی ئێمە کاتێك لە هەر فەلسەفەیەك دەدوێین, دەبێ ئەو فەلسەفەیە لە چوار چێوەی خۆیدا دابنێین, فەلسەفەی درێداش کە لە دواجار نکۆڵی لە هەموو فەلسەفەکانی دیکە دەکات, ڕەنگدانەوەی تەنگژەکانی ئەو فیکرەیە کە فیکری خۆرئاوا پێی گەیشتووە, کاتێك لە ناوەوە هێرش بۆ سەر فەلسەفە دەبا و بە نەزۆکی تاوانباری

دەکات, ئەوکاتە فیکری خۆرئاوا هەڵدەسێ بە دانانی سەرەتای هەموو حەقیقەتێك کەپێ گەیشتووەو دەیکاتە بابەتی پرسیار کردن, تاکو لەبەرامبەر نوێکاندا خۆی بکاتەوە, کە ئێستا فیکری خۆرئاوا پێگەیشتووە و سەرکێشەیەکی نوێی تەقاندۆتەوە.

***سەرچاوەی***

الفکرالعرب 1980 نووسینی(د. جورج زیتانی) المعاهر عدد 6/7 تشرین الاول والپانی

## بەهای هەڵوەشانەوەگەری
## هەر داهێنەرانن لە کاتی بونیادنانەوە هەست بە بەهای هەڵوەشانەوە دەکەن

"ئەگەر هەڵوەشانەوەگەری بەراستی رووخێنــەر بێ.. دەبا لە پێناو لەنوێ بونیادنانەوەدا هــەموو بونیــادە کۆنو شێواوەکان تێکبشکێنین"
"دریدا"

ئەو سەردەمە سەردەمێکە, ناودژیی تیایدا لە زیاد بووندایە, هەروەها وا پێدەچێ کە بەرهەمو کۆی ناودژییەکانی بۆ کەسانێك روونو ئاشکرا بن, کە بە شێوەیەکی ئەزموونگەریو بونیادگەری فیکرییانە لە رێگەی رەخنەوە ئەو مەسەلانە هەڵدەوەشێنێتەوە, بەجۆرەش هەرگیز ناتوانین لەو میتۆدە رەخنەییە دوور بکەوینەوە کە دریدا لە کۆتاییەکانی ئەو سەردەمە گەڵاڵەی کردووە. ناوبانگی دریدا لە ئاسۆی رەخنەوە بەرز بۆوە, بەرلەوەی وەك فەیلەسوفو مێژوونووسو بیریارێك دەربکەوێت, دریدا لە رێگەی فیکرە رەخنەییەکەی کە لەگەڵ رۆحی سەردەم دەهاتەوە, توانی بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە میتۆدەکەی بە هۆی مەدلولە رەنگاورەنگەکانی بە شێوەیەکی زۆر

**زرینگ‌و چالاکانه پراکتیزەی بکات, بەمانایەکی دیکە هات لە ڕێگەی مەدلولە جۆراجۆرو ئالۆزەکانییەوە هاوژیانی لەگەڵ ئەو سەردەمە هەمەرەنگ‌و سریالییە بکات‌و لە هەموو بوارەکانی رەخنەدا سوودییان لێوەرگریّ, ئەوەش بەرهەمی ئەو پرۆژەیە بوو, کە لە دنیادا دەستەیەك لە ئەدیب‌و بیریارانی بە خۆیەوە سەرسام کرد, بەڵام خودی ئەو مەسەلەیە بە فیکرو گوتارەکانی دریداوە پەیوەست نەبوو, بەڵکو بۆ پراکتیزەکردنەکانی دەگەڕێتەوە, چونکە لە توێی ئەو پراکتیزەکردنانەدا کۆمەڵێك دەلالەتی بەهێزی وای هێنایەوە کە پێشتر هیچ کەس دەستی بۆ نەبردبوون.**

**دریدا سەرەڕای سەرکەوتنی لە بەکارهێنانی میکانیزمی میتۆدەکەیەوە. لە نێو فیکری نوێی**

جیهانیشدا به راستی توانی هاوسەنگییەك لـە نێـو فەلسـەفەی (چەسـپاو) بـۆ خـۆی بدۆزێتـەوە, واتـە خوێندنـەوەكانی بـووە هـۆی ئـەوەی لـە یـادەوەری رەخنـەدا كۆمـەڵێك كارلێكـەری بـە نـاوی ئـەوەوە ناوزەد بكرێ.

ئەگـەر سـەیری فیكـری دریـدا بكـەین, دەبیـنین كاریگـەری كۆمـەڵێك میكـانیزمو میتـۆدی هاوچـەرخی بـە سـەرەوەیە, لەوانـەش بونیادگـەریو فیۆلۆژیو ئەركیۆلۆژیو مێـژووە كلاسـیكییەكانو نووسـینە سیاسـییەكانو ئیبداعـە ئەدەبییـەكان... سـەرەڕای ئـەوەش ئـەو پیـاوە رسـتێك رەگـەزی لـە ئـەدەبیاتی لاهـوتی بـە پـەراوێزكراوی لـەخۆدا هەڵگرتبوو, نەك هەر بۆ هەڵوەشانەوە, بەڵكو هـەر لەو رێگەیەوە چاوی بە دنیا هەڵێنا.

ئەگەرچی لە دنیادا فەلسەفەکەی هەر کاریگەری لە سەر ئەوانە هەیە کە تیایدا پسپۆڕن‌و لێکۆڵینەوەیان لە بارەوە کردووە, بەڵام ئەگەر ئەو کاتە بە بیر خۆمان بهێنینەوە کە زانکۆی (کیمبۆرگ) لە فەلسەفەدا بۆ دکتۆرا ناوی کاندید کرد, کۆمەڵێك لە پسپۆڕان‌و زانایان هاتنە بەرەنگاری کردن, نەك هەر دژی فەلسەفەکەی بەڵکو دژی خودی دریداش وەستان, هەر بۆیە دریدا وەسفی خۆی بە جۆرێك کرد کە بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی بە فەلسەفەوە نییە, بەڵکو ئەو بۆ خۆی تەنها کابرایەکی هیچگەراییەو هیچ لەوە ناگات کە دەیڵێ.

بەراستی دان بەوە دادەنێم کە لە هەڵوەشانەوەی رەخنەییدا زۆر کەڵکم لە میتۆدی دریدایی

وەرگرتووە, بەڵام زۆر بە درەنگەوە, هەروەها کاتێك وەك ئوستادێکی مێوان لە فەرەنساوە هاتە زانکۆی (ریدنك) لە بەشی فەلسەفەی زمان لێکچەرێکی پێشکەش کرد,کاریگەری ئەو لێکچەرە بەسەرمەوە زۆر بوو, پاشان لە ساڵی (1977) لە زانکۆی ئۆکسفۆرد سەردانی کۆلێژی (سانت ئەنتۆنی) کرد, بەڵام لەوێ هیچ لێکچەرێکی پێشکەش نەکرد... ئەو کات گەنجێکی قژ پڕو کەمدوو خاوەن تێڕوانینێکی تیژ بوو, زۆر بیری لە جۆری ئەو پرسیارانە دەکردەوە کە بەرەو رووی دەکرانە, بەر لەوەی قسەیان لە بارەوە بکات. لەوێ کۆمەڵێ بیرکردنەوەی بە من بەخشی, هەر ئەو فیکرانەی ئەوێ پاشان بوونە هەوێنی بەرەو

پێشبردنی پرۆژەکەی‌و کاری لە سەر کردن, بەڵام ئەو کات ئەوەندە ناسراو نەبوو.
دریدا کۆمەڵێ لێکچەری بە زمانی ئینگلیزی پێشکەش کرد, بەڵام رستێك لە زاراوەی لاتینی بەکار دەهێنا کە دەکەونە نێوان هەردوو زمانی ئینگلیزی‌و فەرەنسییەوە, ئەو کات زۆر لە ئوستادو قوتابیانی خوێندی باڵا ئامادەیی ئەو لێکچەرانەی دەبوون, ئەو کات دریدا گەنج بوو, سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵێك دەقی فوکۆیی دابووە بەر رەخنەی هەڵوەشاندنەوە, بەڵام لەگەڵ ئەوەش زۆر بە فەلسەفەی (فوکۆ) کاریگەر بوو, ئەو کات کە دریدا رەخنەی لە (فوکۆ) دەگرت, زۆر لە دەزگاکانی بڵاوکردنەوە بە دوای تەرجەمەی کارەکانی (فوکۆ) رایاندەکرد.. بەڵام ئەوەی کە لای

دریــدا تەئكیــدی زێــتری لێدەكرایــەوە بابــەتی زمانەوانیو زاراوەكان بوو.
دێتــەوە یــادم كــە بــە هــۆی ئــەو رەخنــە توونــدو هەڵوەشانەوەئامێزەی كە دریدا ئاراستەی میتـۆدی ئەمبیرقیو دامەزراوەكانی زانكۆ(واتـە ئـەكادیمیای كـۆنی بـەریتانی) دەكـرد, دژبوونەوەیـەك دروسـت بـوو, چـونكە دریـدا وەك خـۆی وەسـفی دەكـرد, پێیوابوو كە هێشتا (زانكۆیەك كە سەرپێچی عەقڵ بكـات-مەبەسـت لـە لێـدانی سـێنترالیزمییەتی عەقڵە:و/كـوردی)و بەرهـەمهێن بـێ دانەمـەزراوە. هەروەها پێیوابوو هەموو دامەزراوە ئەكادیمییـەكان نەزۆكنو هـەر تـەنها یـەك خولیایـان هەیـە ئـەویش ئەمبریقیەتــەو ئــەو ئەمبریقییەتــەش هــەڵگری گوتـارێكی باڵایـە, كـە دواجـار لـە دەرئـەنجامێكی

تێپەڕدا خۆی هەڵدەگرێتەوە, دریدا دەڵێ ئەوەش وامان لێدەکات کە بە جیدی رەخنەی خۆمانی ئاراستە بکەین, بەڵام سەرەڕای ئەو میکانیزمانەی کە بە بیرکردنەوەمەوە پەیوەستە, من بە تیۆرگەلی دیکەوە سەرقاڵم!

## گفتوگۆی نێوان ئێمەی قوتابیو دریدا لە بارەی پۆست مۆدرێرنەوە

قسەکردنی ئەو وەك تەلیسم وابوو جگە لەوانەی کە شارەزان لە زانستی زمانو زانستی فۆنیم.. کەسی دیکە تێینەدەگەیشت, ئێمە کە سێ قوتابی دوو کوڕو کچێك بووین, لە فەلسەفەی مێژووی نوێ ئامادە دەبووین... من بۆ خۆم توانای زمانم ئەوەندە

نەبوو کە بتوانم ئەو زاراوە زۆر ئاڵۆزانەی ئەو هەرس بکەم, هەروەها نەمدەتوانی واتەواتە تایبەتەکانی ئەو تێبگەم, چونکە ئەوەی ئەو دەیگوت و لەگەڵ ئەوەی ئێمە لە میتۆدی زانکۆدا دەمانخوێند دژی یەك دەکەوتنەوە, هەروەها جگە لە کۆمەڵێك بنەرەتی سەرەکی وەك سێنتەرالییەت و سێنترالییەتی بابەت نەبێ, ئەگینا هیچی لێحاڵی نەدەبووین.

ئەو کاتەی (ب کیمب)ی هاوڕێم لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لە (سانت ئەنتونی) مامۆستامان و مێژوونووسی بەناوبانگ (ئەلبرت حورانی) کۆتایی بە سەرپەرشتکردنی نامەکەی هێنابوو, لە دریدای پرسی ئایا هەڵوەشانەوەگەری بۆ دەقی مێژووی سوودمان پێدەگەیەنێ.. ئەو کات هەندێ خاڵم لە

دەفتەری سەرنجەکانی خوێندندا تۆمار کرد کە من وامدەبینی بە نیسبەت میتۆدی هەڵوەشانەوەگەری مێژوویی زۆر گرنگ دەکەونەوە, دواجار من لە کتێبی (هەڵوەشانەوەی پەیکەر) کە لە ساڵی (2000) دەرچوو بەدواداچوونم بۆ کرد, هەروەها دێتەوە بیرم کە ئەو کات دریدا دەربارەی ئەو پرسیارانە دوا, کە ئێمە بە هاوەڵی هەر یەك لە هاوڕێی ئەڵمانیم (تۆماس لنك)و(سابینا دودنباخ) خستبوومانە روو,, بەلاّم هیچ یەك لە ئێمە چەمکەکانی بە هەند هەڵنەگرت... ئەگەرچی پاشان بە تایبەتی لە بواری پرۆسەی رەخنەی ئەدەبو زمان بە گرنگ کەوتنەوە, هەر هەمان شتیش دەشیا لە پراکتیزەکردنی دەقی مێژوویی زۆر سوودییان هەبێ, بەلاّم ئەوەش دەبایە بە پێی

ئەو ملكەچبوونانە بايە كە لە بنەڕەتدا دريدا بۆ هەڵوەشانەوەگەريى دەيويست.

ئەو سەرنجانەى كە هەستم بە گرنگيان كردبوو, لەو بارەوە تۆمارم كردبوو, بەڵام ئەو گرنگييە بۆ من كەوتە ئەو ساڵانەى دوايى كاتێك كە بە ئەزموونى ميتۆدگەرايىو مەعريفىو فەلسەفە جۆراوجۆرەكاندا رەتبووم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم ئەو كەسەى كە نەتوانێ دەق لە ناوەوە بخوێنێتەوە, نەتوانێ سێنتراليیەتى دەق بۆ بەيانكردنى حەقيقەت كەشف بكات, ناتوانێ لە خوێندنەوەى دريدادا سەركێشى بكات, نەك هەر هێندە بەڵكو خوێندنەوەى دريدا كاتى بە فيڕۆ دەدا.

**دريداو تيۆرى هەڵوەشانەوەو پۆست مۆدێرنە**

میتـۆدی هەڵوەشـانەوەگەرێتی لـە بـواری رەخنـەی ئەدەبیدا یەکێکـە لـە گـرنگترین ئـەو بزاڤانـەی کـە دەکەونـە دوای بونیادگەرییـەوە, سـەرەڕای ئـەوەش گەورەترین بزاڤـە کـە تـاکو ئـەمڕۆ دەمـەتەقێیـەکی گەورەی وروژاندبێ. لـە دوایـین(25)سـاڵی سـەدەی بیستەم لە بەرامبەر ئەو میتۆدە گەورەترین حاڵەتی ناودژی لەنێوان هەوادارانو دژەکەی کەوتەوە, هـەتا ئێستاش بە تایبەتی لەو ساڵانەی دواییدا بە یەکێك لە تیۆرەکانی رەخنـەی ئـەدەبی دێتـە ژمـاردن, لـە لایەك لە کۆڵەکەکانی ئـەو رەخنەیـە بـۆ نموونـە (ج. هیلیس میلەر, پۆل دیمان, جیفری هارتمان, هارلۆد بلوم)دەگرێتەوە, ئەوانە بۆ خۆیان سەرەڕای جیاوازی شـێوازو هەسـتیارییان لـە دوو ئاسـتی تیـۆریو پراکتیکی پێشەنگی هەڵوەشانەوەگەریی دەکەن, لە

لایەکی دیکەش کۆمەڵێك رەخنەگرکە دەکەونە خانەی رەخنەی تەقلیدییەوە, هەڵوەشانەوەگەری بە بێ ماناو وێرانکەرو زیانبەخش دەزانن, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ سێنتەرێك چ لە ئەوروپاو چ لە ئەمریکا نەیتوانیووە بەهای ئەو میتۆدە نوێیەی رەخنە پشتگوێ بخات.

دەشێ بڵێین تیۆری هەڵوەشانەوەگەری پێویستی بە کۆمەڵێك شیکردنەوەی نوێ هەیە, بەڵام هەر رەخنەگرێ  کە بۆ شیکردنەوەی ئەو تیۆرە هەوڵبدا پێویستی بە پێناسەکردنی هەڵوەشانەوەگەری نییە, چونکە خودی ئەو تیۆرە ئاڵۆزو بە یەکداچووە رێگا لە پێناسەکردن دەگرێ, بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەش مرۆ دەتوانێ هەوڵی راڤە کردنی ئەو زاراوە بنەڕەتیانە بدات کە دریدا بۆ هەڵوەشانەوەی

رەخنەی تەقلیدی فۆرمگیری کردوون, هەروەك چۆن دەشێ راڤەی ئەو زاراوانەش بکات, کە رێگا بۆ کردەی هەڵوەشانەوەگەری خۆش دەکەن, ئەوە بۆ خۆی دەبێتە هەنگاوی یەکەم کە من لێرەوە پێی هەڵدەسمو دوای شیکردنەوەو وەسفکردنی ئەو زاراوانەی کە دریدا بەرهەمی هێناوە, وەڵامی ئەوە دەدەمەوە کە چۆن دەتوانین لە رێگای ئاراستەکردنی رەخنەییەوە هەڵوەشانەوە ئەنجام بدەین.

وەك بێلایەنێك دەڵێم هەڵوەشانەوەگەری ئەوە نییە, کە پێی دەڵێن ناماقوڵ یان ناپەسەند, چونکە هەڵوەشانەوە هەڵگری ناواخنێکی رۆحییە. لەو ساڵانەی دوایدا نووسینو کتێبەکانی دریدا زۆر یارمەتییان داوم هەروەها لە دووتوێی میتۆدی

**خوێندنمدا یەکێك بوون لەو وێستگانەی کە بەراستی لە خوێندنەوەی دەق فریام کەوتوون, لەگەڵ ئەوەشدا بە دوای دژە نووسینانەکانی ئەو میتۆدەشدا چوومە, چونکە هەندێك لە نەیارانی وایان بڵاو دەکردەوە کە ئەو میتۆدە دەق وێران دەکات. بەڵام ئایا بە راستی هەڵوەشانەوەگەری وێرانکردنە؟. وابزانم باشترین بابەت کە لێیەوە بتوانین وەڵامی پێ بدەینەوەو لەوێوە پراکتیزەی مەبەستەکەمانی پێ بکەین کتێبی(گراماتۆلۆژیا)یە, ئەو کارە بەرزە دریدای فەیلەسوفو رەخنەگری فەرەنسی بەرهەمی هێناوە, دەکرێ وەك زمانی هەڵوەشانەوەگەری تەماشای بکەین.**

من لەو بڕوایەدام کە ئەو لێکۆڵینەوەی دریدا دەیخوازێ, هەروەها تیۆری دریدای لە هەڵوەشانەوەدا بەرامبەر دوو تەگەرەی سەرەکی دەبێتەوە, یەکەمیان من وای دەبینم کە خودی شێوازی دریدای لە تویێی زاراوەو چەمکەکانییەوە وڕوژانو سەرسوڕمان لەخۆ دەگرن. بەڵام دووەمییان ئەو زنجیرە بیروڕا رەخنەئامێزەیە کە سەرەڕای ئەو پڕشنگانەی کە دریدا خستوویەتە سەر هەندێك لەو چەمکە گرانانە, هەروەها ئەگەرچی فۆرمگێریشی کردوون, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکەونە ژێر بەد تەئویلی, یان ناشێ تەئویلیان بۆ بکەین, من لێرەوە بەر لەوەی چەمکەکانی هەڵوەشانەوەگەری هەڵسەنگێنمو وەسفیان بکەم بە

شـێوەیەکی رەخنـەیی هەنـدێ قسـەیان لـە بـارەوە دەکەم.

ئـەوەی جێگـای بـە بـیر هێنانـەوە بـێ"نووسـین" و "ئاخافتن" دوو تەوەرەن کە دەشێ لەوێوە دەست بـە تێگەیشتنی خۆمـان بۆ هەڵوەشـانەوەگەری بکـەین, ئەو دوو وشەیە لە تێگەیشتنی تەقلیدیانەی زمانـدا دەلالـەتی تایبـەت بـە خۆیـان هـەڵگرتووە. ئـەو تێگەیشـتنەش لـە بـەرایبوونی ئاخافتنەوەیـە(واتـە ئاخاوفتن-عـەقڵ بە سـێنتەر دادەنـێن- و/کـوردی) هەنـدێکیش لـە رەخنـەگران بڕوایـان وایـە هەڵوەشانەوەگەری کە دریدا هێناویەتە ناوەوە لە بـە سـێنترالبوونی عەقڵـەوە بـەرەو بـە سـێترالبوونی نووسینمان دەبات, ئەو سەرنجە نیاز پاکی تیا نییە, بۆیە بەر لەوەی گوزارشت لـە دەلالەتـەکانی بکـەین

**دەبێ راڤەی بکەین, هەروەها من وای دەبینم باشترین رێگە بۆ روونکردنەوەی ئەو مەسەلەیە ئەوەیە کە لە رێگای پێوانەوە هەوڵی بە ساکارکردنی بدەین.**

**دریدا ئەو جۆرە نووسینەی کە چەمکی زمانی تەقلیدیو زمانەوانی نوێ پشت گوێ دەخات, بە "نووسینی بازاڕی" ناوزەد دەکات. بەو مانایەش رەخنەگرتن لە هەر قەسیدەیەك واتە کەشفکردنی ماناکانی ئەو قەسیدەیە, ئەو مانایەی کە دەشێ فیکرەو چەمکەکانی بە فیکرەی دیکەوە پەیوەست بکەین, پرۆسەی کۆکردنەوەی فیکرەکانو بە یەکەوەلکانیان لە تێگەیشتنی ئێمەوە بۆ کەینوونەی باڵا دەگەڕێتەوە.**

## دریدا کێیە؟

پێشـــەنگی قوتابخانـــەی هەڵوەشـــانەوەگەرییە لـــە ڕەخنەدا, دەڵێن کە یەهودییەکی فەرەنسیو ئەسـڵی جەزائیرییە, لەو (دە) ساڵەی دوایدا, لـەپاش ئـەوەی لـە پانتـایی زانسـتیو فەلسـەفی ئەوروپییـدا بـە شێوەیەکی زانستی میتۆدەکەیکێشـیکی بـۆ خـۆی پەیدا کرد, ناوبانگێکی جیهـانی بـە دەسـت هێنـا. هـەروەها قوتابخانەکـەی لای هەنـدێ لـە لێکۆڵـەرو ڕەخنەگران بە یەکێك لە قوتابخانە هـەرە گرنگـەکان دێتە ژماردن. دریدای فەیلەسوف جۆرێکی تایبەتە, لە دووتوێی زمـانەکەی خۆیدا ئاینو ئـۆین دەکـات, بەڵام بە وردبینییەکی لە پێوانە بەدەر توانـای خـۆی لـــە تێگەیشـــتنی زاراوەکانـــدا بـــەکاردەهێنێو هوشیـاریش لە چـەمـەکاندا, وەك دەزانـین دریـدا بـە

سەوداسەری میتۆدێك دەژمێردرێت كە بە هەڵوەشانەوەگەری ناونراوە,ئەو میتۆدەش تا رادەیەكی زۆر لە پەرتبوونو دووبارە هەوڵدان بۆ بونیادنانەوەیەكی نوێ دەچێ, هەندێ لەوانەی دراسەیان كردووە, پێیانوایە دریدا چێژ لە رەشكردنەوەی ئەو یەكێتیە وەردەگرێ كە ئەدەبو فەلسەفەو سیاسەت وەك سێ بۆگەنكردوو بە یەكەوە كۆدەكاتەوە, بەڵام ئەو لەیەكجیاكردنەوەی ئەویش هەر تەنها وەهمەو لە حاڵەتی ئەو شێتە دەچێ كەدەیەوێ زمانێكی یاخی دابمەزرێنێ تاكو دنیا بەو هەموو كۆشكو تەلارانەی كە لە سەر سێنترالیبیەتی(عەقڵ) دامەزراوە, لە پانتاییەكانی نووسیندا هەڵوەشێنێتەوە. هەر ئەوەشە پاڵ بە دریداوە دەنێ لە قولایی شێتبوونی خۆیەوە

بنووسێ, پێناسێك هەڵگرێ كـه جـێگیر بـوونی بـۆ نییه, نووسـینێك بنووسـێ كـه لـه نووسـینی هـیچ سـەردەمو كاتێـك نەچـێ, دەمێكـه دریـدا بــه شـێوەیەكی زۆر ترسـناك تاوانبـار دەكـەنو وای لێدەكەن كه بكەوێته پەراوێزی ئاكارەوە, بـەڵام ئـەو مەسـەلانه بـۆ دریـدا جێگـای دڵخۆشـین, چـونكه دەزانـێ هەرتـەنها میتۆدەكـەی ئـەوە كـه بتوانـێ هەڵوەشـانەوە ئـەنجام بـدا, میتـۆدی ئەوانیدیكـه ناتوانن خودی ئەو هەڵوەشێننەوە.

كتێبی (گراماتۆلۆژی) گرنگییەكەی لەوەوە دێ كه به بێ وەستان چینه به سەر یەك كەڵەكـه بووەكـان, یەك به دوای یەك لادەبـات, بـێ ئـەوەی چـڕی دەقو تەرەسـوباتی زەوی بـەرایی دەق بێتـه هـۆی دانـای سـنورێك بـۆ هەڵوەشـانەوە, هـەروەها دریـدا مانـا

جێگیر ناکات هەر تەنها بۆ سەرفرازبوونی مانا نەبێ, ڕێی هیچ سێنتەرێك ناگرێتە بەر تەنها بۆ شوێن گۆڕینو لە نەخشە لادانی نەبێ, هەروەها دەیەوێ لە تەوەرەکەیەوە بیگوازێتەوە, هەموو ئەوانەش لە تویێی کردارێك بە جێ دەهێنێ کە لە وەرگێڕانەوە دوور نییە, وەك چۆن دەیەوێ شتەکان لە خودی خۆیان دووربخاتەوەو پارچە پارچەیان بکات, تاکو لەوێوە شوناسەکەیان لێ ون بکات ئەو شوناسەی کە دەکەوێتە پشت کەڵەکە بوونو گواستنەوەو لادانە بێ سنوورەکانەوە, لەو ئاستەدا دەشێ ئەنجامگیری دریدا وەك (هێزێکی تێکدەر) دەربکەوێ کە تەنها لە پێناو ڕەشکردنەوەی بنەڕەتو تەقاندنەوەی پارچەکانی نەبێ دەست بۆ هیچ شتێك نابات. هەرلێرەوە بە دواداچوونو

سیتیماتیزەکردنی فیکری دریداو گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەو فیکرە لە کۆی یەکەیەکدا قورس دەکەوێتەوە.

**ئایا لە لێکچەرە کۆنەکانی دریدا چ سوودێکم وەرگرتووە؟**

وەك دەردەکەوێ ئەو لێکچەرانەی کە لە ساڵی (1977) لە زانکۆی (ئۆکسفۆرد) پێشکەشی کردوون هەمان شتیشی لە زانکۆی (ردنك) ی ئینگلتەرە پێشکەش کردووەو من لە هەر دوو لێکچەردا بەشداریم کردووە, لەو لێکچەرە جەوهەری کتێبی (گراماتۆلۆژیا)ی پێشکەش کردین, بە تایبەتی کاتێك بەراوردی پاڵشتو

دەرچوونەکانی ئەو کتێبەی بۆ کردین, ئەو کتێبە بۆ خۆی رستێکە لە میکانیزمو ماناو شتگەلێکی بەهرەبەخشو رێکو پێك بە تایبەتی بۆ ئەو رەخنەیەی کە توانای چارەسەری هەموو دەقێك بە تایبەتی دەقی مێژوویی ئینجا دەقی سیاسی پێیە, دەشێ ئەو میکانیزمەی دریدا بۆ ئەو دەقانەش بە کار بهێنین کە بەر لە سەدان ساڵ نووسراون, ئەگەرچی دەکەوینە نێو پرۆسەیەکی ئاڵۆزو قورسەوە, بەڵام دەتوانین دەرئەنجامی سەرسامکەریان لێ بە دەست بهێنین.

دەشێ گرنگترین ئەو پاڵپشتانەی کە دریدا لە میتۆدی هەڵوەشانەوەگەری بەکاری هێناون, بەجۆرە کورتیان بکەمەوە یەکەمیان: نووسین بۆ خۆی لە خۆوەو کتوپڕ دێ (مەعریفەی نووسراویش واتە

رەنگدانـەوەی نووسـراوەکان, بـەڵام بـە بـێ ئـەوەی پێیان بزانێ, بە بێ ئـەوەی درك بـە بنەڕەتـەکانیان بکـــــات), چـــــونکە وەك (ســـــوقرات)و (فیـــدرۆس)و(ئـــەفلاتوون)دەڵـــێن نووســـین لـــە ئەفسانەوە سەرچاوەی گرتووە.

دووەم: لای دریـــدا لـــە نووســـیندا پڕۆســـەی هەڵوەشانەوە (پێویسـتە, بـەڵام درۆئامێزیشـە) بـۆ خۆی دەبێتـە تەلەزگەیـەکی لـۆژیکی نـەك هـەر بـۆ کەشـفکردنی وەهمـەکانو بـەس, چـونکە نووسـەری کارا لەگەڵ خۆیدا خودێکی فرە جۆرو ناودژە, هـەر وەك دەق چۆن ناودژو فرە جـۆرە, ئـەوەش بـەردەوام لـە دووتـوێی هەڵوەشـانەوەی شوناسـی دەلالـەتـەوە تەعبیر لە گواستنەوەی مانای ئامادە دەکات.

سێیەم: جەختکردنی هەڵوەشانەوەگەری هەر تەنها لە سەر کەشفکردنی وەهمەکان ناوەستێ, بەڵکو ئەو کەشفکردنەیە کە هونەرمەندان لە هونەری نووسین پرۆسیسەی دەکەن و لەو کەشفکردنەدا خەڵك هەبوونی راستیە درۆئامێزەکانیان وەك وەهم دێتە بەرچاو, بە تایبەتی لە هەندێ مەسەلە کە بۆ زانینی زۆر تینوون.

سەرچاوە:

لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە.

بەشێکە لە کتێبێکی (د. سیار جميل) بە ناونیشانی (نسوه ورجال: ذكريات شاهد الرويه:القيد)

له هەندێ شوێن كەمێ دەسكاریم كردووە, بەڵام ناوەڕۆكی بابەتەكەم نەشێواندووە(و:كوردی).

چەمكی زانستیو رەخنە لە سێنترالیزم خۆرئاوایی

هەموو ئەو لێكۆڵەرو بیریارە خۆرئاواییانەی كە رەخنە لە سێنترالیزمی خۆرئاوایی دەگرن, وەك شەبەنگێكی لە یەكنزیك دەردەكەون, بۆ نموونە (كلۆد لیڤی ستراوس) كە زۆر لەو چەمكانەی لەق كردووە كە زانستی ئەنترۆپۆلۆژیای لە سەر بونیاد نراوە, نەخوازە چەمكەگەلی كۆمەڵی سەرتاییو خزمایەتیو ئەفسانەو هتد, خودی ئەو كارەی

ستراوس نەوەیەك لە ئەنترۆپۆلۆژیەکانی وا لێکرد کە چاو بەو پرنسیپانە بخشێننەوە کە (بالاندییە) وەك بنەڕەتێك لەپشت کۆلۆنیالیزمەوە دەیانبینێ، لەوێشەوە دەیانەوێ زانستی ئەنترۆپۆلۆژیا وەك زانستێکی سەربەخۆ کە بە دراسەکردنی گەلو ترادیسیۆنەکانەوە بەندە، بخەنە بەرچاو.

بەلام (میشیل فوکۆ) ئەرکە سەرەکییەکەی لەو بۆچوونە نوێیەوە دەردەکەوێ کە بۆ بەدواداچوونی مێژوو هەیەتیو لەوێشەوە دەیەوێ بە ناوکۆیی گەشەی مێژوویی خۆرئاواوەوە بەندی بکات، سەرەڕای ئەو رەخنەیەی کە دەیگرێتە خولیای مرۆڤی خۆرئاوایی، دەسبەسەراگرتنی حەقیقەت لەلایەن ئەو مرۆڤەو چەسپاندنی زانستی خۆرئاوایی

**بە تایبەتی لـە سـەر هـەمان حەقیقـەتی نـاوبراو بـە سەر گەلانی دیکەوە.**

**هەروەها (جاك دریدا) هات تاكو چەمكی نووسـین لە فیكری خۆرئاوایی لەق بكات, چـونكە ئاخـافتن هەر لە ئەرستۆوە لە سەر حیسابی نووسین بـە پـیرۆز دادەنرێ, دریدا لـە كتێبـی (گرامـانۆلۆژیـا)دا وەك دەقو مێژووو كەلەپور سەیری نووسین دەكات.**

**دواجار دەتوانین بلّێین شەپۆلی پۆسـت مۆدێرنـە لـە بـاری تیـۆریو فیكرییـەوە پشـتی بـەو چـەمكانە بەسـتاوەو بەشـداری لێكترازانـی بەسـێنتەربوونی خودی خۆرئاوایی كردووە, ئەو خودەی كە خـۆی بـە خاوەنو هەلّگری رۆشنگەری خۆرئاوایی دادەنێ.**

**بـەلاّم چـەمكی زانسـت كـە بـە كلیلـی شۆڕشـی پیشەسـازی دادەنـرێ ئـەو شۆڕشـەی كـە ئـەورووپای**

نـوێی دروسـت کـرد, لـه سـەر ئاسـتی بنـەڕەتو پرینسـیبەکانی خۆرئاواییـەوە نەکەوتۆتـە بـەر رەخنـەوە, بـە قـەد ئـەوەی رەخنـە بۆخـۆی لـە سـەر هەمان ئەو رێسایە رابۆتەوە کە خـودی زانسـتی لـە سەر بونیاد نراوە.

(فیربانـد) تاکـە بیریارێکـە کـە رەخنـەی خـۆی لـە دووتوێی گەشەی ناوکۆیی‌و بواری تیۆری‌و زانسـتی ئاراستەی چەمکی زانست کردووە, هەروەها لە سەر حیسـابی ئەفسـانەو ئەسـتێرەگرتنەوە گومـانی لـە پێشخستنەکانی خۆی کردووە, کتێبەکـەی(زانسـت لـە کۆمەڵگـەی ئـازاد) کـە -ئەلسـەید نـەفادی- تەرجەمەی زمـانی عـەرەبی کـردووەو لـە دووتـوێی پرۆژەی ناسیونالیزمی بۆ تەرجەمـە بڵاوکراوەتـەوە, هـەڵگری جیاکارییـەکی فیکرییـە کـە لـە هـەمان

بـواری نـاوبراودا دەخولێتـەوە. ئـەوەی کـە زانـراوە ئەوەیە کە فیرباند سـەرەتا لـە شـانۆیی ئەڵمانییـەوە هاتۆتە ناوەوە, بە تایبەتی لەگـەڵ تیبـی (برێخـت) دەسـت بـە کـار بـووە, لـە پاشـاندا کەوتۆتـە دوای (ئیرنهافتی فیزیایی), ئیرنهافت هەر یەك لە تیۆری نسـبی (ئاینشـتایین)و چـەندایەتی (مارکسـی) رەتکردۆتەوە, هـەروەها بـە نیسـبەت عەقڵانییـەتی زانستی بـەردەوام هەڵوێسـتی پەڕگیرانـەی هـەبووە, پاشان فیرباند چـاوی بـە (کـارل پۆپـەر) کـەوتووەو کارل پۆپەر خاوەنی ڕێبـازی واقیعییـەتی رەخنـەیی بـووە, فیربانـد کەوتۆتـە ژێـر هەنـدێ لـە فیکرەکانییەوە, بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بـە ئەسـیلی نـەزانییووە, بۆیـە نکـۆڵی لـەوە کـردووە کـە وەك یارمەتیدەرێك کاری لەگەڵدا بکات.

پاشان هەوڵی موناقەشەکردنی مەسەلەی عەدەمی داوەو ڕێچکەیەکی جیای بە لێکۆڵینەوەی زانستی بەخشیووە, وێنەگەلێکی جیاوازی لە بارەی ناعەقلانییەتی زانستی کێشاوە, لە تویێی ئەو وێنەگەلەشدا نکۆڵی لە ڕێچکەی زانستی یان بابەتییانە کردووە, هەر لەوێشەوە بانگەشەی ئەوە دەکا کە ئەگەر پێشکەوتنێکی قابیلی جیاکاری زانستیو قابیلی درککردن لە ئارادابێ, ئەوە خۆی دەبێتە دەرئەنجام, چونکە زانایان هەموو ئەو ڕێسایانەی تێکشکاندووە کە قابیلی عەقلانییەتە.

### فرە حەقیقەتی

بەجۆرە ئەو دێ بە نسبەت زانست بەرگری لە فرە حەقیقەتی دەکات, هەروەها فرەیی بۆ خۆی

شەقلێکی جەوهەری هەموو ئەو مەعریفانەیە کە بانگەشەی بابەتخوازی دەکەن, چونکە فرەیی رێگە بەوە دەدا کە بە توونـدی رەخنە لە فیکرە مەقبولەکانیش بگیرێ, نەك لەگەڵ ئەو رووداوانە بەراود بکرێن کە لە باری تیۆرییەوە خۆیان بە سەربەخۆ دادەنێن, بۆیە فیرباند بۆ رێبازی وانەگوتنەوە (رێبازێکی داهێنەرانەی تایبەت) داوا دەکات, چونکە پێیوایە دەبێ لە پاڵ بیۆلۆژیای گەشەکردو, فیزیای چەندایەتیو نیسبییەتدا شوێنێك بۆ سیحرو ئەستێرەگرتنەوەو جادوگەری لەئارادا هەبێ, هەروەك لێرەدا دەبێ ئازادییەکی تەواو لە تاقیکردنەوەی (سیستەمی مەعریفە) لە ئارادابێ, تاکو مرۆڤ بتوانێ دایبڕێژێ, هەر لە بەر هەندێ فیرباند دروشمی (هەموو شتێ بە ئاسایی

بەرێوە دەچێ)ی بەرزکردبۆوەو پێیوابوو کە ئەوە تاکە پرنسیپێکە کە ناتوانێ پێشکەوتنی زانست جڵەو بکات, هەروەها تاکە هۆیەکە بۆ تێگەیشتنی مێژوو.

لە دوای ئەوەوە فیربانـد لـە پێنـاو بـەرگریکردن لـە کۆمەڵگا, هەڵیکوتاوەتە سەر ئەو هێرشە بەربڵاوەی کە بە دژی زانستو پیاوانی دەکرێ, ئەو وایـدەبینی کە کۆمـەڵگای سەربەسـت دەشـێ شـوێنی هـەموو جۆرە بیروراو ئایینزاو رێکخراوێکی خۆرئاوایی تیا ببێتـەوە. هـەروەها پێیوابـوو کـە ئـەو سـەرکەوتنە گریمانکراوەی خۆی بەهاوپەیوەستی زانست دادەنێ, دەشێ دەستدرێژی کردن بـێ بـۆ سـەر زانسـتو بـۆ زۆربەش وەك بابەتی ئیمان تەماشا بکرێ, سەرەڕای ئەوەش زانسـت سیسـتەمێکی تایبـەتی ناگرێتـەوە,

بەڵكو بەشێك لە بنەڕەتی سەرەكی كۆمەڵگا پێكدەهێنێ. بۆیە وەك دەردەكەوێ تاكە ڕێگایەك بۆ كۆنترۆڵكردنی كەڵەگایانەی زانست لە چاخی بیستەمدا ئەوەیە كە دامەزراوە زانستییەكان بخرێنە ژێر چاودێری شەعبیو دامەزراوە دیموكراسییەكانەوە, مرۆڤی ئاسایی واز لە سەرپەرشتیكردنی زانست بهێنێ, بەجۆرە زانستو زانایان دەبنە خزمەتكاری كۆمەڵگا نەك گەورەی كۆمەڵگا.

ڕەخنەی فیرباند بۆ چەمكی زانست بە ڕەتكردنەوەی ئەو بنەڕەتانەوە بەندە كە خودی چەمكی عەقڵو چەمكی زانستی لە سەری دامەزراوە, ئەو وایدادەنێ كە عەقڵ هەر بە تەنها فاكتەرێك نییە كە ڕووبەرووی تەقالیدەكانی دیكە دەبێتەوە, بەڵكو

لە خودی خۆیدا وەك هەر تەقلیـدێکی دیکـە وایـە, کە وەك پێویست نە باشەو نە خراپـە, لـە سـەر ئـەو بنەڕەتـە فیربانـد پـیرۆزیو سـێنترالیەتی عـەقڵ کـە کەلـەپوری رۆشــنگەری مۆدێنــە چەســپاندوویەتی رەتدەکاتــەوە. بــەو پێیــەش عــەقڵ لەگــەڵ زانســت هاوگونجـاو نایەتـەوە, هـەروەك لـە تواناشـی دانییـە بەشداری لە گەشەکردنیدا بکات, بۆیە ئەوانـەی کـە بە زانسـت سەرسـامن پێویسـتە لـە نێـوان عـەقڵو زانست پارێزگاری لە یەکێکیان بکەن, لەبەر ئەوەی ناشێ پارێزگاری لـە هـەردووکیان بکـەیت. چـونکە رابوونەوەی زانست بۆ خـۆی لـە دژی عەقلانییـەتو لە دژی پـەلپو بیانووگـەلێکی بـەربلاوە کـە پێشـتر بڕوای پێیان هـەبوو, هـەروەك چـۆن لـە تـوێی ئـەو بیــانووە بەربلاوانــەوە هاتۆتــە ئــاراوە کــە بــە دژی

هەستو بە دژی درککردنی هاوبەش کەوتوونەتەوە, بۆیە دەبینین چەمکی زانست بە پێی سەردەمو زەمان گۆڕانی بە سەرداهاتووەو دەکەوێتە ژێر نیسبیەتو مێژووەوە. ئەوەش ئەو نیسبیەتەیە کە فیرباند بەرگری لێدەکات, چونکە بەشێکە لە خودی زانست, تیۆری فیزیایی نوێی"زانستی"یش نکۆڵی لێ ناکات, بەڵکو دەیسەلمێنێ. بۆیە وەك فەیلەسوفێك گاڵتەی بەوانە دێ کە خۆیان بە خزمەتکاریی زانستی دادەنێن, چونکە دواجار خودی فەلسەفە بۆخۆی دەبێتە سەرچاوەی زانستو هەروەها ئەو بوارەی کە تەواوی ئەو تیۆرە نوێیانەی بەرەو زانست دەکەنەوە هەر لەوێوە هەڵدەقوڵێن.

زانایان

لـــه دوای ئـــەوەوە فیربانـــد رەخنـــەکانی خـــۆی بـــۆ هێرشکردنە سەر خـودی زانایـان گوازتـەوە, چـونکە ئەوان وادەزانن وەك چۆن پێشـان بـەرگری لـە تـاكو تەنیایی کەنیسەی رۆما دەکرا, هەر بە هەمـان شێوە دەیانەوێ بەرگری لە زانست بکەن, پێشـان هـەموو ئەوانەی کە دەکەوتنە دەرەوەی کەنیسە بە بێ مانـاو کافر دادەنران, ئەگەرچی ئێستا کۆمـەڵێك رێگا لـە بەر دەستدایە کە لەوێوە زانایان مـوناقەشەو مـەرایی پێوە بکەن, بەڵام ئەوان دێن پشـت بـە هـەمان ئـەو رێگایانە دەبەستن کە رۆژێـك لـە رۆژان بـۆ گوتـاری ئایینی وەك گەنجینیەك تەماشا دەکرا, ئێستاش بـۆ زانست وەك شـوێنگەیەکی نـوێ تەماشـای دەکـەن, ئـــەو جـــۆرە لـــە پـــەیمان بەســـتنە توونـــدەی نێـــوان دامـــەزراوەکانی دەوڵـەتو دامـــەزراوەکانی زانســـت

لەوێوە بە هێز دەبێ کە وەك چۆن پێشتر کەنیسە بەشێك بوو لە بونیادی سەرەکی کۆمەڵگا بە هەمان شێوەش سەیری زانست بکرێ, بەڵام وەك دەزانین دواتر بە شێوەیەکی ئاشکرا کەنیسە لە دەوڵەت جیاکرایەوە, بەڵام هەتاکو ئێستاش دەوڵەتو زانست بە یەکەوە کار دەکەن, زانایانیش جێگای پیاوانی کەنیسەیان گرتۆتەوە, بۆیە لێرەدا خودی کۆمەڵگا دەبێتە ملکەچی گوتەزاکانی پیاوانی زانست, ئەوەش لەوەوە دێ کە زانست وەك پێوانەی راستیو حەقیقەت سەیر دەکرێ, رێگای رزگاریو سەرفرازیش لە راستیو حەقیقەتەوەیە.

بۆ ئەوەش نموونەی ئەو مانیڤیستە دەهێنێتەوە کە لە ساڵی (1975) لەلایەن کۆمەڵێك لە زانایان کە ژمارەیان (168) زانا بوو (19)ش لەو

زانایانــه هــەڵگری خــەڵاتی نۆبــل بــوون بــە دژی زانســتی ئەســتێرەگرتنەوە راگەیانــدرا. خوێندنــەوەی ئەو مــانیڤێستە ئەوەمان بۆ کەشـف دەکـات کـە لـە پشــت ئــەو بانگەشــەکردنە جگــە لــە پیاهەڵــدانی بابەتخوازیو پاکێتیو عەقڵانییـەت شـتێکی دیکـە وجــودی نییــە, دواجــار ئــەو مــانیڤێســتە هــەڵگری کۆمــەڵێك مــژدەی ئایینییــە, ســەرەڕای ئــەوەی لــە پشت نمایشکردنی ئـەو مـانیڤێسـتەوە فاشیسـتیەت کاری خۆی دەکرد, ئـەگینا ئەگـەر ئـەو زانایانـە بـۆ خۆیان قەناعـەتێکی بـە هێزییـان هـەبێو بیانـەوێ دەسەڵاتی خۆیان لە پێناو ئەو قەناعەتەوە بخەنە کار (168) ئیمـزا بۆچـی کۆدەکەنـەوە, لـە کاتێکـدا چەسپاندی ئەو مەسەلەیە هەر تـەنها بیـانووی تاکـە کەسـێکی بەسـە. بـەڵام ئـەوان وەك لـە گفتوگـۆی

رۆژنامەکان دەردەکەوێ, هەر بۆ خۆشیان نازانن لەچی دەدوێن, هەندێکیان بە هیچ شێوەیەك زانستی ئەستێرەگرتنەوەیان نەخوێندۆتەوەو لە بارەی ئەو فیکرەوە هیچ شتێکیان پێ نییە. لێرەوە فیرباند قسە لە راستبێژی رەها دەکات کە پێیوایە شان بە شانی نەزانی رەها رێگا دەبڕێ. ئەگەر تەماشای مانیڤێستی ئەو زانایانە بکەین دەبێ بڵێین بە داخەوە, چونکە لە بەرامبەر ئەو مانیڤێستەشدا دەبینین زانستی ئەستێرەگرتنەوە بە شێوەیەك تەواوی دنیای گرتۆتەوە, دەتوانیین لەگەڵ مانیڤێستی (پاپایی) کە گومڕایانی پێ وشیار دەکرێتەوە وەك هاودەق سەیرییان بکەین, ئەوەش تەواو لەگەڵ گوتەی زانا هاوچەرخەکان پێچەوانە دەکەوێتەوە, چونکە نە ئەوان دەتوانن بەو

هێرشکردنه (زانستی ئەستێرەگرتنەوە) لـە خۆیـان دوور بخەنەوە, نە مەعریفەش ئەمرۆ هێندە بێ هێزە لە بارەی ئەو بابەتەوە تاکو بیـەوێ هـەوڵی گـۆڕینی بدات.

فیرباند ئەو مانیڤێستە وا وەسف دەکات کـە پشـتی بە ئەنترۆپۆلۆژیای بەر لە تۆفان بەسـتاوە, هـەروەها ئەو مـەودایەش دەخاتـەروو کـە زانایـان خۆیـان تیـا ئامـادەکردووە تـاکو دەسـەڵاتی خۆیـان بـە سـەر کۆمـەڵێك بوار بچەسپێنن کـە ئەسـڵەن هـیچ جـۆرە مەعریفەیەکییان لە بارەوە نییە.

هـــەروەها ئەوانـــەی بـــە بیـــانووی جێگیربـــوونو ســەرکەوتنو زێــتر پەســەندی بــەرگری لــە زانســت دەکــەن, فیربانــد پێیــان دەڵــێ کــە ئــەو جــۆرە ســـەرکەوتنە لـــە دەرئـــەنجامی لێکۆڵینـــەوە یـــان

بیـــانووەوە نەکەوتۆتـــەوە, بـــەڵکو دەرئـــەنجامی
پاڵەپەســـتۆی سیاســـیو دامـــەزراوەکانو خـــودی
عەسـکەرتارییەتە, بۆیـە پێویسـت ناکـات هیچـی
دیکـە لـە رێگـەی بەخششـەکانی زانسـتەوە دوای
پیاهەڵدانی زانست بکەوین, بـەڵکو فیربانـد پێمـان
دەڵێ ئەگەر پیاهەڵـدان راسـت بکەوێتـەوە ئـەوە لـە
سـەرمان پێویسـتە کـە زۆر بـە حەماسـەتو سـەد
ئەوەندە بە ئەفسانە هەڵبلێین, چونکە بەخششـەکانی
زۆر گەورەترە, بـە پلەیـەك کـە قـابیلی پێوانـەکردن
نییــە, لــە کاتێکــە کــە داهێنــەری ئەفســانە بــە
بونیادنـــانی رۆشـــنبیریی هەڵســـاون کـــاری
عەقڵانیخوازەکان ئەوە بووە کـە بـە تـەواوی گـۆڕان
بـە سـەرئەو رۆشـنبیرییە بهێـنن, بـەڵام لـە زۆربـەی
جـاردا تـەنها ناشـتوانن شـتێکی باشـتر لـەوان

پێشکەش بکەن, بەمجۆرەش زانست هەر تەنها وەك ئایدیۆلۆژیایەك لە ئایدیۆلۆژیەکان دەمێنێتەوە, هەتا لە دەوڵەتیش نەکرێتەوە ناتوانێ وجودی خۆی پراکتیزە بکات.

سەرچاوە:

لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە (رەزوان جەودەت زیادە) نووسیویەتی

بڕوانە: www.alimbaratur.com

ناوەڕۆك